# سێ مۆرکی ڕێزمانی کوردی

ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)

ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ـە)

ڕێزمانی پاشگری کار (ەوە)

پرۆفیسۆر

د. شێرکۆ بابان

کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

هەولێر ٢٠١٦

# سێ مۆرکی ڕێزمانی کوردی

ڕێزمانی مۆرفیمی نێستایی ( ـە )

ڕێزمانی نامرازی پەیوەندی ( ـە )

ڕێزمـانـی پاشـگری کــار ( ەوە )


پرۆفیسۆر

د. شێرکۆ بابان

کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر



هەولێر ٢٠١٦

ریزبەندی دەرچەی

چاپخانە : (٢٥٦٢) لە

- ناوی کتێب: سێ مۆرکی ڕێزمانی کوردی
- ناوی نووسەر: پ. د. شێرکۆ بابان
- بابەت: ڕێزمانی کوردی
- تیراژی ( ٣٠٠) دانە
- دیزاین: دەزگای گۆڤار بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە (ماهر موعین مستەفا)
- چاپی یەکەم / ٢٠١٦
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٨) ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە.

# پێشەکی

بە ڕاستی و بە دروستی، ئەو سێ بابەتەی کە لە ئەم کتێبەدا گردکراونەتەوە، بریتین لە سێ (مۆرکی ڕێزمانی کوردی)، چونکە زۆر ئەستەمە بە ڕێزمانی زمانانی دی، یان بە تیۆری سەرتاسەری زمانەوانی لێك بدرێنەوە و بخرێنە نێو چوارچێوە. لە لایەکی ترەوە، ڕێزمانی ئەو سێ مۆرفیمە بریتیە لە کێڵگەیەکی بە بڕشت بۆ شرۆڤەکاری دەنگسازی، چونکە هەرسێکیان بە بزوێنی /ـە/ دەست پێ دەکەن و دەبن بە ناوك لە چێوەی (بڕگەی ناتەواو)دا، واتە ئەو جۆرە بڕگەیەی کە چاککردنەوەی پێویستە لە ڕیزی ئاخاوتندا. لە ڕێزمانی کوردیشدا، ئەو سێ مۆرکە زۆر بێ خزمەتن و ڕێزماننووسانیش دەستی خۆیان لە ئاستیان پاراستوە، چونکە ناتوانرێت بەراورد بکرێن بە ڕێزمانی زمانانی دەوروبەر، یان بە ڕێزمانی زمانە ئەوروپیەکان. لە ئەم بوارەدا، چەند ڕێزمانووسێك قاوغیان شکاندوە و لێی دوان، بەلأم نەیان توانیوە بی خەنە نێو چوارچێوەی بابەتی ڕێزمانی کوردی. مامۆستای خوالێخۆشبوو (مامۆستا ڕەئووف ئالانی) ئیشی زۆری لە سەری کردوە، یان مامۆستای بەڕێز (د. نەسرین فەخری) ئیشی بەراورکاری وردی هەیە، بەلأم خوالێخۆشبوو (مامۆستا مەسعوود مەمەد) زۆر بلیمەتانە بەرەو چینە قووڵەکان هەنگاوی ناوە و خۆی جودا کردوەتەوە لە ڕێزماننووسانی دی، چونکە لە ڕێزمانی کوردیدا گەمەکەی خۆشکردوە. ئێمەیش کەڵکمان وەرگرتوە لە ئیشی ئەو سێ مامۆستایە، بە تایبەتی ئەوانەی مامۆستا مەسعوود محەمەد. بێگومان، زۆری تر باسی ئەو سێ بابەتەیان کردوە، بە تایبەتی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی نامەی ماستەر و دکتۆرا، بەلأم ئێمە هیچ کەڵکێکی ئەوتۆمان لێیان وەرنەگرتوە، تا بیان کەین بە سەرچاوە. لە لایەکی ترەوە، بە سایەی ڕێزمانی ئەو سێ مۆرکەوە، نیوەی ڕاستی تیۆری (پلیکانەی ڕستە) دابینکرا (وەك لە خوارەوە نیگارکراوە). لە پلیکانەی ڕستەدا، ئەو سێ مۆرکە سێ خانەی هاوڕیز و نەگۆڕیان هەیە (لە کلکی ڕیزەکەوە)، وەك:

**(١): مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، لە خانەی {٧-}دا.**

**(٢): پاشگری (ەوە)، لە خانەی {٨-}دا.**

**(٣): ئامرازی پەیوەندی (ـە)، لە خانەی {٩-}دا.**

| تۆ | | | داـ | نە | | گر | | | ت | وو | | | ەتـ | ەوە | ە سەر زەوی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦+ | ٥+ | ٤+ | ٣+ | ٢+ | ١+ | سفر | ١ | ٢ | ٣- | ٤ | ٥ | ٦ | ٧- | ٨- | ٩ - |

تیۆری پلیکانەی ڕستە: بە نموونەی (تۆ دات نە گرتووەتەوەسەر زەوی)

**زێدەباری، بە سایەی کێشە دەنگسازیەکانی ئەو سێ مۆرکەوە، زۆربەی هەرە زۆری (تیۆری زەبری بزوێن) دابینکرا. لە بەرەنجامدا، چێوەی بنیادی بڕگە بە دوو خانەی پێکەوەلکاو و بە دوو گیرفان نیگارکرا (لە خوارەوە). بە دیاریکراوی، گیرفانی دامێن (گ د) لە جەمسەری کلکی خانەی بزوێن (خ ب)دایە و گیرفانی نووك (گ ن) لە جەمسەری سەری خانەی نەبزوێن (خ ن)دایە. بە ڕاستی، ئەو دوو تیۆریەی کە باسکران (پلیکانەی ڕستە و زەبری بزوێن)، دەشێت بە سەر گشت زمانەکاندا بچەسپێرێن، بەلأم هەر زمانێك بە شێوازی تایبەتی خۆی.**




چێوەی بڕگە لە تیۆری زەبری بزوێندا: بە نموونەی وشەی (سپۆرت):

## ناوەڕۆك

# کەرتی یەکەم

## ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)

لە زۆر جێدا ئێمە دەڵێین: لە شیکارسازی زانستیدا، ئێمە منەتبار و قەرزداری ڕێزمانی (مۆرفیمی ئێستایی)ین، چونکە وەك چرایەکی دەستی بە کارمان هێناوە، چی لە شیکاری ڕێزمانیدا و چی لە شیکاری دەنگسازیدا. لە سەرەتادا، زانیمان کە ئەم مۆرفیمە دەنگی خپی /ت/ هەڵ دەگرێت و ئەو دەنگەیش هەر بە (تیۆری زەبری بزوێن) دەدۆزرێتەوە. هەر بە ئەو تیۆریە، نزرگەی مۆرفیمی ئێستاییمان دۆزییەوە لە ژێر سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن)دا، واتە لە خانەی {٧-}دا، لە (پلیکانەی ڕستە)دا. بە ڕاستی، بە سایەی ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستاییەوە، هەردوو تیۆری (زەبری بزوێن) و (پلیکانەی ڕستە) دابینکران، چونکە بۆ ئێمە کاریگەرترین کەرەستەی ڕێخۆشکەر بوو لە بیر خەستکردنەوەدا. هەروەها، هەردوو تیۆرییەکەیش بریتی بوون لە کەرەستەیەکی بەکار و بلیمەت بۆ یەکلاییکردنەوەی ناسنامەی مۆرفیمی ئێستایی، چی لە ڕووی ڕێزمانەوە و چی لە ڕووی دەنگسازیەوە. لە لایەکی ترەوە، بە بەراورد بە زمانی عەرەبی و ئنگلیزی و فەرەنسی، ئەم مۆرفیمە ڕێزمانێکی مۆرکاوی هەیە لە زمانی کوردیدا، چونکە بریتیە لە چووزەرەی ڕستەسازی لە کاری بێڕووداوی (بوون)دا و لە سەرپاکی ڕێژەی (ڕابردووی تەواو)دا. لە ئەم گۆشەنیگایەوە، مۆرکی مۆرفیمی ئێستایی بە ئەو زمانانەوە دیارە، بەڵام نەکراوە بە بابەت. ئەوەیش لە یاد نەکەین کە هەردوو مۆرکی ئامرازی پەیوەندی (ـە) و پاشگری (ەوە) ڕۆڵێکی گەورەیان دەگێڕا لە شرۆڤەی ئارێشەکانی مۆرفیمی ئێستاییدا. بە ڕاستی، ئێمە بایەخێکی لە ڕادەبەدەرمان داوە بە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، تەنانەت، دوو کتێبمان لە سەری بڵاوکردوەتەوە، وەك:

(١): مۆرفیمی ئێستایی (ـە)/ هەولێر ٢٠٠٦

(٢): پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)/ هەولێر ٢٠١٥

## بابەتی یەکەم

# مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ژێر جێناودا بە بەڵگە[1]

### ١/١: دەسپێك:

لە زۆر جێدا و لە زۆر بڵاوکراوەدا، ئێمە گوتوومانە: مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، ئەگەر هەبێت لەڕیزەکەدا، بە سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن) دادەپۆشرێت[1]. نووسینەکانی ئێمە، لە چەندین کتێب و لە چەندین لێکۆڵینەوەدا، ئەوەیان سەلماندوە، بەڵام زۆرجار ئەو ناونیشانەی سەرەوە بە نامۆیی دەچێتە بەرگوێ و بەرچاوی خوێنەران و ڕێزماننووسان. یان، لە هەندێك جێدا، وا باس دەکەن کە ئێمە بە شێوەی (ڕەها) باسی ئەو ڕاستیە دەکەین[2]. بێگومان، جۆرە بابەتی ئاوها ورد و سفت و دانسقە، خوێنەر و توێژەری خۆی دەوێت و کاری (خوێندن)ی پێویستە، نەك (خوێندنەوە)ی رووکەشیانە. لە ئەم نووسینەیشدا، جارێکی دی ڕوو دەکەینەوە لە ئەو بابەتە، بە ئەو هیوایەی ئەمجارەیان جوانتر و کاریگەرتر بیرۆچکەکان ڕیز بکەین و ئامانجەکە گەمارۆ بدەین[3]. لە ئەم گۆشەنیگایەوە، بە جۆرێك لە جۆرەکان، ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بایکۆتکراوە، بەڵام بۆ ئێمە ڕێزمانی ئەم مۆرفیمە هەم چرای دەستیە و هەم نەخشەڕێگایە، چی لە دەنگسازیدا و چی لە ڕێزماندا.

### ٢/١: نەخشەی دابەشبونی مۆرفیمی ئێستایی:

مۆرفیمی ئێستایی (ـە) تەنیا و تەنیا هەر لە دوو ڕووبەری زمانەکەدا هەیە و لە ئەو دوو ڕووبەرەیشدا لە ڕێژەی تێپەڕ و تێنەپەڕدا هەیە، وەك:

یەکەم: لە دەمکاتی ڕانەبردووی کاری (بوون و هەبوون)دا، کە لە ئیشەکانی ئێمەدا بە (ڕانەبردووی ئێستایی) ناسراوە. لە ئەم ڕووبەرەیشدا، دابەشبوونی جێناوی لکاو و مۆرفیمی ئێستایی بە ئەم چەشنەیە:

---

[1] گۆڤاری (ڕامان). ژمارە (٨١). هەولێر ٢٠٠٤.

- ڕێژەی تێنەپەڕ:

بکەر: {م، یت، ـە، ین، ن، ن}

- ڕێژەی تێپەڕ:

بکەر: {م، ت، ی، مان، تان، مان}

بەرکار: {م، یت، ـە، ین، ن، ن}

دووەم: لە دەمکاتی (رابردووی تەواو)ی گشت کاری زمانەکەدا. لە ئەم ڕووبەرەیشدا هەمان دابەشبوونی جێناو هەیە. وەك:

ڕێژەی تێنەپەڕ:

بکەر: {م، یت، ـە، ین، ن، ن}

ڕێژەی تێپەڕ:

بکەر: {م، ت، ی، مان، تان، یان}

بەرکار: {م، یت، ـە، ین، ن، ن}

بە سەرنجێکی ورد لە ئەو دابەشکردنەی سەرەوە، دەردەکەوێت کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە گەڵ سێتە جێناوی (م، یت، –، ین، ن، ن)دایە. ئەو سێتە جێناوەیش لە ڕێژەی (تێنەپەڕ)دا لە ئەرکی (بکەر)دایە و لە ڕێژەی (تێپەڕ)دا لە ئەرکی (بەرکار)دایە. ئەمە و ئەگەر ئەو دوو دەمکاتە و هێزی تێپەڕین لێك بدەین، دەتوانین بڵێین: مۆرفیمی ئێستایی لە چوار دۆخدا بۆی هەیە دەربکەوێت، وەك لە کۆپلەکانی (٢/١، ٤، ٥، ٦)دا ڕاڤە دەکرێن.

٣/١: رانەبردووی ئێستایی (تێنەپەڕ):

لە ئەم ڕووبەرەدا، تەنیا هەردوو کاری (بوون و هەبوون) هەیە، وەك لە سەر نەخشەی (١/١) نموونەڕێز کراون. لە ئەو نەخشەیەدا، سێتە جێناوەکە بریتیە لە (م، یت،

- ، ین، ن، ن) و مۆرفیمی ئێستایی لە جێی جێناوی نادیاری کەسی سێیەمی تاك دەرکەوتوە و ڕیزەکە بوە بە (م، یت، ـە، ین، ن، ن). کەواتە، تەنیا میکانیزم بۆ سەلماندنی هەبوونی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ژێر ئەو سێتە جێناوەکەدا، بریتیە لە هەبوونی (کەلێن)ێك لە ڕیزەکەدا. ئەو کەلێنەیش بریتیە لە جێناوی نادیاری کەسی سێیەمی تاك، وەك: (م، یت، [redacted]، ین، ن، ن). بە واتایەکی دی، هەر پێنج جێناوە دیارەکە مۆرفیمەکە دادەپۆشن و جێناوە نادیارەکەیش ڕێ دەدات کە مۆرفیمەکە دەربکەوێت. یان، سێتە جێناوی (م، یت، [redacted]، ین، ن، ن) بریتی نیە لە جێناوی سادە و ساکار، بەڵام بریتیە لە جێناوی نا سادە، یان لە (ڕێژەی کار) بۆ هەردوو کاری (بوون و هەبوون)، چونکە هەر جێناوێك لە ئەو سێتە جێناوە دوو مۆرفیمی گوزەراندوە: یەکەمیان (جێناوی داپۆشەر) و دوەمیان (مۆرفیمی ئێستایی داپۆشراو).

| کاری بوون بە ڕووتی | کاری (بوون + ناوەڵناو) | کاری (هەبوون) |
| --- | --- | --- |
| من — (م) | من دڵسۆز(م) | من هە(م) |
| تۆ —(یت) | تۆ دڵسۆز(یت) | تۆهە(یت) |
| ئەو — (ە) | ئەو دڵسۆز(ە) | ئەو هەیـ(ـە) |
| ئێمە — (ین) | ئێمە دڵسۆز(ین) | ئێمە هە(ین) |
| ئێوە — (ن) | ئێوە دڵسۆز(ن) | ئێوە هە(ن) |
| ئەوان — (ن) | ئەوان دڵسۆز(ن) | ئەوان هە(ن) |

نەخشەی (١/١) سێتەڕێژەی کاری بوون و هەبوون بە بەراود

٤/١: ڕانەبردووی ئێستایی (تێپەڕ):

لە ئەم ڕووبەرەدا، ئەرکی ئەو سێتە جێناوەی کە لە پێشەوە باسکرا دەگۆڕێت بۆ (بەرکار). وەك لە سەر نەخشەی (٢/١) دەرخستەی بۆ کراوە، لە نموونەکانی لای چەپدا

هەمان میکانیزم دەچەسپێت. وەك لە کۆپلەی پێشوودا باسکرا، سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن، ن) دەرکەوتوە، بەلاّم وەك (بکەر) نا، بەس وەك (بەرکار). بەلاّم لە کەلێنی کەسی سێیەمی تاکەوە، مۆرفیمی (ـە) دەرکەوتوە و ڕیزەکە بوە بە (م، یت، ـە، ین، ن، ن). ئێستایش ئەگەر بە سەرنجێکی وردەوە ئەو دوو دەستە ڕستەیەی نەخشەی (٢/١) بەراورد بکەین، دەتوانین میکانیزمێکی دی دەستنیشان بکەین. ئەو میکانیزمەیش بریتیە لە جێگیرکردنی (بەرکاری لکاو) بە (بەرکاری جودا). واتە، جێگیرکردنی سێتە جێناوی (م، یت، - ، ین، ن، ن) بە جێناوە جوداکانیان (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان). لە دەستەی یەکەمدا، جێناوی جودا بەکارهێنراوە و جێناوی لکاو لابردراوە، کەچی لەژێر هەر شەش جێناوەکەدا، مۆرفیمی (ـە) ئاشکرابوە. پاشان، ئەگەر ئاراستەی پێچەوانە وەربگرین و جێناوە جوداکان بگۆڕین بە جێناوە لکاوەکان (لای چەپ)، دەبینین کە ئەو جێناوانە مۆرفیمی (ـە) دادەپۆشن. دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی لە کەسی سێیەمی تاکدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە جێناوە لکاوەکەی نادیارە و نادیاریش ناتوانێت هیچ تەنۆلکەیەك دابپۆشێت.

| بەرکار بە جێناوی جۆدا | بەرکار بە جێناوی لکاو |
|---|---|
| تۆ من /ت/ پێویستـ(ـە) | تۆ پێویستـ/ت/(م) |
| من تۆ (م) پێویستـ(ـە) | من پێویستـ(م)(یت) |
| من ئەو (م) پێویستـ(ـە) | من پێویستـ(م) (ـە) |
| ئێوە ئێمە(تان) پێویستـ(ـە) | ئێوە پێویستـ(تان)(ین) |
| ئێمە ئێوە(مان) پێویستـ(ـە) | ئێمە پێویستـ(مان)(ن) |
| ئێمە ئەوانە(مان) پێویستـ(ـە) | ئێمە پێویستـ(مان)(ن) |

نەخشەی (٢/١): دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ژێر هەر شەش جێناوەکە

٥/١: ڕابردووی تەواو (تێنەپەڕ):

لە ئەم ڕووبەرەدا، دووجۆر لە (تێنەپەڕ) هەیە، کەبریتین لە (تێنەپەڕی ئاسایی) و (تێنەپەڕی بکەرنادیار):

| تێنەپەڕی ئاسایی | تێنەپەڕی بکەرنادیار |
|---|---|
| من ڕۆیشتوو(م) | من نووسراو(م) |
| تۆ ڕۆیشتوو(یت) | تۆ نووسراو(یت) |
| ئەو ڕۆیشتوو (ە) | ئەو نووسراو(ە) |
| ئێمە ڕۆیشتوو(ین) | ئێمە نووسراو(ین) |
| ئێوە ڕۆیشتوو(ن) | ئێوە نووسراو(ن) |
| ئەوان ڕۆیشتوو(ن) | ئەوان نووسراو(ن) |

لە ئێرەدا، پێویست ناکات هەموو نموونەکان ڕیزبکەین، چونکە هەر ئەوەندە بەسە بۆ لێکدانەوەی بابەتەکە. لە ئەم نموونانەدا، دوو میکانیزم هەیە بۆ بینینەوەی و بۆ ناسینەوەی مۆرفیمی ئێستایی، وەك:

میکانیزمی یەکەم:

وەك لە پێشەوە باسکرا، جێناوی کەسی سێیەمی تاك نادیارە و مۆرفیمەکە لە داپۆشین دەرباز بوە و بەئاشکرا دیارە، وەك (م، یت، ـە، ین، ن، ن). ئەم میکانیزمە بریتیە لە هەمان میکانیزم کە لە پێشەوە ڕوون کرایەوە.

میکانیزمی دوەم:

ئەگەر ئەو ڕیزە جێناوەی (بکەر) بخشێنین لە(بزوێن)، ئەوا (زەبری بزوێن) دەگات بە دەنگە خپەکەی /ت/ و مۆرفیمەکە لە داپۆشین دەربازدەکات. لە یەکەم هەنگاودا، ئەگەر پاشگری (ەوە) بخشێت لە ڕستەکانی کەسی سێیەمی تاك، ئەوا مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ڕوخساری خۆی بە تەواوی دەردەخات و دەبێت بە (ـەت)، وەك:

ئەو ڕۆیشتوو (ە) ← ئەوڕۆیشتوو(ەت)ـەوە

ئەو نووسراو(ە) ← ئەو نووسراو(ەت)ـەوە

لـەدوەم هـەنگاودا، ئەگـەر هـەمان پاشـگری دووپـات کردنـەوە بخشـێنین لـە پێـنج جێناوەکەی دی، ئەوا مۆرفیمی (ـەت) بـە ڕوخسـاری تـەواوی (ـەت) لـە ژێـر جێناوەکـە دەرباز دەبێت، وەك:

من ڕۆیشتوو(م) ← من ڕۆیشتوو(م)(ـەت)ـەوە

ئێمە نووسراو(ین) ← ئێمە نووسراو(ین)(ـەت)ـەوە

تۆ ڕۆیشتوو(یت) ← تۆ ڕۆیشتوو(یت) (ـەت)ـەوە

ئێوە نووسراو(ن) ← ئێوە نووسراو(ن) (ـەت)ـەوە

ئەوان ڕیشتوو(ن) ← ئەوان ڕۆیشتوو(ن) (ـەت)ـەوە

لە ئێرەدا، بە ئاشکراو بەبێ کەلێن، لە ژێر هەر پێنج جێناوەکە مۆرفیمی ئێستایی دەرهێنراوە (بەزەبری بزوێن). کەواتە، ئەو سێتە جێناوە، وەك لـە ڕووی واتاییـەوە بـە مۆرفیمی ئێستاییەوە ئـاوەژوون، لـە ڕووی مۆرفۆلۆژییـەوە هـەر ئـاوەژوون. ئێسـتایش، دەتوانین چەند بەڵگەیەك ڕیز بکەین بۆ سەلماندنی هەبوونی مۆرفیمی (ـە) لە ژێر سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن)دا.

بەڵگەی یەکەم:

کاتێـك کـە نموونـەکانی کەسـی سـێیەمی تـاك وەرگـیرا، جێناوەکـە نادیـار بـوو و مۆرفیمەکە لە جێیەکەی دەرکەوتبوو. لە ژێر زەبری بزوێنـدا، مـۆرفیمی ئێسـتایی (ـە) ڕوخسـاری گـۆڕی بـۆ ڕوخسـاری ڕەسـەنی خۆی(ـەت). بـە هـەمان شـێوە لـە هـەر پێـنج جێناوەکەی دیکەیشدا، هەر ڕوخساری (ـەت) پەیدا بوو.

بەڵگەی دوەم:

ئەگەر بە سەرنجێکی ورد، دوو جێناوی (م) بەراورد بکەین، وەك: (من ڕۆیشتم : من ڕۆیشتووم)، دەبینین کە ئەو دوو جێناوە زۆر جیاوازن بە (واتادانەوە)، تا ئـەو رادەیـەی ئەگەر زۆر لە جێناوی (م) بکەین، ئەوا نموونەی یەکەم ناتوانێت (ـە) وەربگرێت و ببێت (مـن رۆیشـتمە*)، کەچـی رسـتەی دوەم دەتوانێـت وەری بگرێـت و ببێـت بـە (مـن ڕۆیشتوومە)، چونکە لە جۆری رابردووی تەواوە.

بەڵگەی سێیەم:

ئەگەر رابردووی تەواو بەراورد بکەین لەگەڵ ئەو ڕابردوانەی کە جێناوەکانیان مۆرفیمی ئێستایی هەڵ ناگرن، وەك:

| | |
|---|---|
| من ڕۆیشتم (ـەت)ەوە* | (ڕابردووی نزیك) |
| من دەڕۆیشتم (ـەت)ەوە* | (ڕابردووی بەردەوام) |
| من ڕۆیشتبووم (ـەت)ەوە* | (ڕابردووی دوور) |
| من ڕۆیشتووم (ـەت)ەوە | (ڕابردووی تەواو) |

دەبینین کە سێ نموونەکەی یەکەم واتایان بزرکاوە (*)، چونکە جێناوەکان سادەن لە مۆرفیمەکە و ئێمە بە زۆری زۆردار دامان ناوە، بەڵام لە نموونەی چوارەمدا، لە بەرئەوەی جێناوەکە مۆرفیمەکە هەڵ دەگرێت، رستەکە ڕاستە و ڕێزمانیە، چونکە جێناوی (م) سادە نیە.

بەڵگەی چوارەم:

لە بەر ڕووناکی خاڵی پێشوو، ئەگەر لە ئەو چوار جۆرە ڕابردوەدا، مۆرفیمەکە (ـە ت) فڕێ بدەین، ئەوا سێ ڕابردوەکەی (نزیك، بەردەوام، دوور) ڕاست دەبنەوە و (رابردووی تەواو) دەبزرکێت، وەك:

| | |
|---|---|
| من ڕۆیشتم (ـــ)ەوە | (ڕابردووی نزیك) |
| من دەڕۆیشتم (ـــ)ەوە | (ڕابردووی بەردەوام) |
| من ڕۆیشتبووم (ـــ)ەوە | (ڕابردووی دوور) |
| من ڕۆیشتووم (ـــ)ەوە* | (ڕابردووی تەواو) |

بە سەرنجێکی ورد، دەردەکەوێت کە لەڕستەی چوارەمدا (*) بزڕکانێك پەیدابوە، بە هۆی ئەو کلۆرییە مۆرفۆلۆژیەی کە لە دیواری ڕستەکەدا هەیە. لە بەرانبەردا، سێ ڕستەکەی سەرەتا کلۆرییان تیدا نیە. بۆ زانین، نیشانەی ئەستێرە(*) بۆ ئەو ڕستانە دانراوە کە لەنگن بە ڕێزمان و کلۆریەك یان زێدەڕۆییەك لە بنیادەکەیاندا هەیە.

٦/١: ڕابردووی تەواو (تێپەڕ):

لە ئەم ڕووبەرەدا، ئەو سێتە جێناوەی کە مۆرفیمی ئێستایی دادەپۆشن (م، یت، ـە، ین، ن، ن)، ڕۆڵی (بەرکار) دەبینن. ئەمە و ئەگەر بمانەوێت مۆرفیمی ئێستایی بدۆزینەوە، دەتوانین ڕوو بکەین لە ئەم میکانیزمانەی خوارەوە.

میکانیزمی یەکەم: وەك لە پێشەوە باس کرا، لە بەر ئەوەی جێناوی کەسی سێیەمی تاك نادیارە، لە ئەو کەلێنەوە مۆرفیمەکە دەرکەوتوە و سێتە جێناوەکە بە ڕوخساری (م، یت، ـە، ین، ن، ن) دەرکەوتوە، وەك نموونەکانی لای ڕاست لە نەخشەی (٣:١)دا.

میکانیزمی دووەم: وەك ڕێزمانەکە ڕێ دەدات کە (بەرکار)ی لکاو بگۆڕێن بە (بەرکار)ی جودا، دەتوانین جێناوەکانی (بەرکار) دەربخەین لە ریزەکەدا، وەك نموونەکانی لای چەپ لە نەخشەی (٣/١)دا. لە ئەمێدا، بە ئاشکرا دیارە کە بە لابردنی جێناوەکانی (م، یت، ـ ین، ن، ن)، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بەجێ دەمێنێت. سەبارەت بە کەسی سێیەمی تاك، کە لە هەردوو ریزە نموونەکەدا دەرکەوتوە. لە ڕیزی لای ڕاستدا، بە میکانیزمی یەکەم دەرکەوتوە، بەڵام لەڕیزی لای چەپدا بە میکانیزمی دووەم دەرکەوتوە. لەگەڵ ئەوەیشدا،

دەركەوتنی مۆرفیمی (ـە) لە هەر شەش ڕستەكەدا بە یەكسانی، ئەوە دەسەلێنێت كە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) جێناو نیە و بێبەریە لە كەس و لە ژمارەی كەس.

| جێناوی لكاو | جێناوی جودا |
|---|---|
| تۆ نووسیوت (م) | تۆ(من)ت نووسیو(ە) |
| من نووسیوم(یت) | من(تۆ)م نوسیو(ە) |
| من نووسیوم(ە) | من(ئەم)م نوسیو(ە) |
| ئێوە نووسیوتان(ین) | ئێوە(ئێمە)تان نووسیو(ە) |
| ئێمە نووسیومان(ن) | ئێمە(ئێوە)مان نووسیو(ە) |
| ئێوە نووسیوتان(ین) | ئێوە(ئێمە)تان نووسیو(ە) |

نەخشەی (٣/١): دەركەوتنی مۆرفیمی ئێستایی لە ژێر هەر شەش جێناوەكە

میكانیزمی سێیەم: دەتوانین هەموو نموونەكان بە یەكسانی بخشێنین لە بزوێنەكەی بەرایی، لە پاشگری دووپاتی (ەوە)دا، بۆ ئەوەی ئەمجارەیان بە زەبری بزوێن مۆرفیمەكە پیشان بدەین. بێگومان، (زەبری بزوێن) دەخشێت لە كلكی مۆرفیمەكە و دەنگی خپی /ت/ دەدۆزێتەوە. لە ئەنجامدا، مۆرفیمەكە بە قەبارەی تەواوەوە وەك (ـەت) دەردەكەوێت. لە ئێرەدا، لە هەر شەش ڕستەكەدا، بە یەكسانی مۆرفیمی (ـەت) دەرهێنراوە لە كەسی سێیەمی تاكدا، مۆرفیمەكە لە روخساری (ـە)وە بوە بە(ـەت) و لە پێنج كەسەكەی تردا، مۆرفیمەكە لە ئێسكی جێناوەكە دەرهێنراوە بە زەبری بزوێنەكەی پاشگری دووپاتی هەر بوەتەوە بە (ـەت)، نەخشەی (٤/١).

| جێناوی لكاو | جێناوی جودا |
|---|---|
| تۆ نووسیوت (م) | تۆ نووسیوت (م) ـەتـەوە |
| من نووسیوم(یت) | من نووسیوم(یت) ـەتـەوە |
| من نووسیوم(ە) | من نووسیوم(–) ـەتـەوە |
| ئێوە نووسیوتان(ین) | ئێوە نووسیوتان(ین) ـەتـەوە |
| ئێمە نووسیومان(ن) | ئێمە نووسیومان(ن) ـەتـەوە |
| ئێوە نووسیوتان(ین) | ئێوە نووسیوتان(ین) ـەتـەوە |

نەخشەی (٤/١): دەرئاژنینی مۆرفیمی ئێستایی (ـەت) بە زەبری بزوێن

لە ژێر هەر شەش جێناوەكە

ئێستاش دەتوانین چەند بەڵگەیەك ڕیز بكەین بۆسەلماندنی هەبوونی مۆرفیمی (ە) لە ژێر جێناوەكاندا:

بەڵگەی یەكەم:

لە نموونەیەكدا، وەك ( من ناردوومن) جێناوی (ن) شەبەنگی واتای مۆرفیمەكەی هەڵ گرتوە، چونكە: ئەگەر جێناوەكە بكەین بە جێناوی كەسی سێیەمی تاك، كە نادیارە، ئەوا مۆرفیمەكە لەجێی بەركاری لكاو (ن) خۆی ئاشكرا دەكات، وەك: (من ناردوومی: من ناردوومە).

بەڵگەی دووەم:

لە ئەو نموونەیەدا، ئەگەر بەركاری لكاو (ن) بكەین بە بەركاری جودا(ئێوە)، ئەوا جێناوی (ن) لادەچێت و مۆرفیمەكە لە جێگاكەیدا دەردەكەوێت، وەك: (من ناردوومی: من (ئێوە)م ناردوە)

بەڵگەی سێیەم:

ئەگەر هەمان ڕستە بخشێنین لە (بزوێن)ێك، ئەوا زەبری بزوێنەکە، بۆ ئەوەی دەنگێکی کۆنسۆنانت پەیدابکات، مۆرفیمەکە ڕادەکێشێت و ئامادەی دەکات لە ریزەکەدا، وەك: (من ناردوومن): من ناردوومنەتەوە).

بەڵگەی چوارەم:

ئەگەر هەمان نموونەی (من ناردوومن) بکەین بە ڕابردووی (نزیك، دوور، بەردەوام)، کە گیانی (ئێستایی) هەڵ ناگرن، ئەوا مۆرفیمەکە زیندوو نابێتەوە. لە بەڵگەی یەکەمدا، ئەگەر نموونەی ڕابردووی نزیك وەربگرین و جێناوی (ن) بکەین بە کەسی سێیەمی تاك، کە نادیارە، وەك: (من ناردمن : من ناردم )، ئەوا دانانی مۆرفیمی ئێستایی دەبێت بە (ناڕێزمان)، چونکە جێناوی (ن) سادەیە و مۆرفیمەکەی هەڵ نەگرتوە، نە بە واتا و نە بە روخسار.

بەڵگەی پێنجەم:

لەبەر ڕووناکی خاڵی پێشوو، ئەگەر لە ڕستەی (من ناردمن)دا بەرکاری لکاو (ن) بکەین بە بەرکاری جودا (ئێمە)، ئەوا بە هیچ جۆرێك مۆرفیمەکە نادۆزینەوە، وەك: (من ناردمـن : من(ئێوە)م نارد ). لە ئێرەیشدا، دانانی مۆرفیمەکە دەبێت بە (ناڕێزمان) چونکە جێناوی (ن)سادەیە.

بەڵگەی شەشەم:

لە بەر ڕووناکیی خاڵی پێشوو، ئەگەر لە ڕستەی (من ناردمن)دا، جێناوی بەرکاری لکاو (ن) بخشێنین لە بزوێن، ئەوا مۆرفیمەکە دەرناکەوێت، وەك: (مـن ناردمـن): مـن ناردمنـ ـەوە).

بەڵگەی حەوتەم:

بە بەراوردی نێوان بەڵگەکانی (یەکەم، دوەم، سێیەم)، بە بەڵگەکانی (چوارەم، پێنجەم، شەشەم)، دەردەکەوێت کە جێناوی (سادە) هەیە، وەك (ن) لە (من ناردمن)دا و جێناوی ناسادە هەیە، وەك هەمان جێناوی (ن) لە نموونەی (من ناردوومن)دا، ئەم بەڵگەیەیش درزێك دەخاتە نێو ئەو بیروبۆچوونانەوە کە لە ڕێزمانی دێریندا هەیە، چونکە ئەو دوو جۆرە جێناوە لە یەکتری جودا نەکراونەتەوە.

بەڵگەی هەشتەم:

ئەگەر ئەو دوو نموونەیەی سەرەوە، بە ئەم چەشنە بنووسین: (من ناردوومنـــەوە* : من ناردمنەتەوە*)، دەبینین کە هەردوویان هەڵەن (*)، یان ئەگەر بە ئەم چەشنە بیان نووسین: (من ناردوومنـەتـەوە : من ناردمنـەوە)، ئەوا هەردوو ڕستەکە ڕاست دەبنەوە. کەواتە، ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە وبە ئاشکرا دیارە کە جێناوەکەی ڕابردووی تەواو ئاوەژوە بە مۆرفیمی ئێستاییەوە.

بەرانبەر بە ئەو بەڵگانەی سەرەوە، لە سەر ئاستی زانکۆیی و سەرووتر، دەبێت ڕێزماننووسانی ئەمڕۆ (٢٠١٦/٢/١٤) چی بڵێن و چۆن وەڵام ئامادە بکەن. مەگەر لە بێ بەهرەییدا بڵێن: (زمانەکە خۆی وایە، یان: ئەمە زیادەیەکی ڕێزمانیە، یان: ئەمە مۆرفیمی بۆشە، ...). ئەمە و لە هەر جێیەکدا کە شەبەنگی واتای مۆرفیمەکە هەبێت، مۆرفیمەکە بە سێ میکانیزم ئاشکرا دەکرێت (بە ڕوخسار). ئێمە لە ئەو باوەڕەداین ئەگەر (شەبەنگی واتا و شەبەنگی روخسار) لە یەك جووت بکرێن، بەهێزترین بەڵگەی پەیدا دەبێت بۆ سەلماندنی کێشەکە، چونکە ئەگەر شەبەنگی روخساریش بسوێت و دیار نەمێنێت، شەبەنگی واتایی ناسوێت و هەر دەمێنێت.

### ٧/١: بەرەنجام و پوختەکاری:

لە سەرپاکی ڕووبەری زمانەکەدا، مۆرفیمی ئێستایی هەر لە دوو ڕووبەردا هەیە. یەکەمیان: رووبەری رانەبردووی ئێستایی، واتە هەردوو کاری (بوون و هەبوون)، دوەمیان: ڕووبەری ڕانەبردووی تەواو بۆ هەموو کاری زمانەکە. لە ئەو ڕووبەرانەدا، ئەگەر ڕێژەکە (تێنەپەڕ) بێت، ئەوا مۆرفیمەکە لە جێی جێناوی (بکەر) دەردەکەوێت و ئەگەر ڕێژەکە (تێپەڕ) بێت، ئەوا لە جێی جێناوی (بەرکار) دەردەکەوێت.

مۆرفیمی ئێستایی (ە) لە بنج و بنچینەوە داپۆشراوە و نادیارە بە ڕوخسار، بەڵام دیارە بە (رامانی واتایی). یان، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە سێتە جێناوی (م، یت، —، ین، ن، ن) دادەپۆشرێت و واتاکەی لە واتای جێناوەکەدا دەتوێتەوە. بە واتایەکی دی، دوو بەرەبابی ڕێزمانی (جێناو + مۆرفیمی ئێستایی ـە) یەك دەگرن بەرەبابێکی سێیەم (ڕێژەی کار) پەیدا دەکەن، کە بریتیە لە سێتە ڕێژەی کاری (بوون).

دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی، بە بەردەوامی لە جێی کەسی سێیەمی تاك، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئەو جێناوە نادیارە. هەر لەبەر ئەوە ڕیزەکە دەبێت بە (م، یت، —، ین، ن، ن). واتە، هەبوونی مۆرفیمەکە لە ڕیزەکەدا، ئەوە دەگەیەنێت کە لە ژێر پێنج جێناوەکەی تریشدا هەیە، بەس بە داپۆشراوی، وەك: (م/ـە، یت/ـە، ـ/ـە، ین/ـە، ن/ـە، ن/ـە).

مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ئەگەر نەخشابێت لە سەری (بزوێن)، هەر بە روخساری (ـە) دەردەکەوێت، بەڵام ئەگەر خشابێت لە سەری (بزوێن) بە ڕوخساری (ـەت) دەردەکەوێت، چونکە دەنگی خپی /ت/ لە ژێر زەبری بزوێندایە.

ئێمە ڕوخساری (ـەت) بە ڕوخساری بنجی مۆرفیمەکە دەناسین و دەنگی /ت/ بە دەنگێکی خپ دادەنێین، کە تەنیا و تەنیا هەر بە (زەبری بزوێن) گۆ دەکرێت.

لە رابردووی تەواودا، ئەگەر (بەرکاری لکاو) هەبوو، ئەوا گۆڕینی بە (بەرکاری جودا) دەبێت بەهۆی جوداکردنەوەی مۆرفیمەکە لە ئەو جێناوە لکاوەی کەدای پۆشیوە. لە هەڵوێستی ئاوەها، لە هەر شەش کەسەکەدا مۆرفیمەکە دەردەکەوێت.

بە پێچەوانەی ئەو خاڵەی پێشەوە، لە هەر جێیەکدا، (بەرکاری جودا) کرا بە (بەرکاری لکاو)، ئەوا ئەمەی دوایی مۆرفیمەکە دادەپۆشێت و ناهێڵێت لە ڕیزەکەدا دەربکەوێت.

لە بەر ڕووناکی ئەوەی گوترا، مۆرفیمی ئێستایی (جێناو) نیە و کەس و ژمارەی کەس هەڵ ناگرێت، چونکە لە گەڵ هەر شەش کەسەکەدا دەردەکەوێت.

وەك مۆرفیمی ئێستایی (جێناو) نیە، لە جووتبووندا، سێتە جێناوی (م، یت، ـ، ین، ن) دەگۆڕێت بۆ سێتە ڕێژەی کاری بوون (م، یت، ـە، ین، ن، ن).

مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە کەوڵی (جێناو) دەرباز نابێت، مەگەر بە سێ میکانیزم. یەکەمیان: هەبوونی جێناوێکی نادیار (جێناوی کەسی سێیەمی تاك)، دوەمیان : لابردنی جێناوی لکاو بە جێناوی جودا، سێیەمیان: بە (زەبری بزوێن) بۆ ئەوەی بزوێنەکە کلکی مۆرفیمەکە بگرێت و بە (جووتە دەنگ) دەری بهێنێت لە کەوڵی جێناوەکە.

هەندێك جار بە زۆرکردن، دەتوانین مۆرفیمەکە گۆبکەین، وەك (هاتووم: هاتوومە).

لە هەر جێیەکدا، کە ڕێژەی (ڕانەبردووی بوون و هەبوون) و (ڕابردووی تەواو) هەبێت، ئەوا مۆرفیمەکە لە کەوڵی جێناوەکەدایە و دەتوانین، ئەگەر ڕێزمانەکە ڕێ بدات، بە یەکێك لە ئەو خاڵانەی سەرەوە، بی دۆزینەوە.

لە هەر جێیەکدا کە مۆرفیمەکە بە زۆر لاببەین، ئەوا (بزرکان) پەیدا دەبێت. بە پێچەوانەوە، لە هەر جێیەکدا کە مۆرفیمەکە نەبێت و بە زۆر بی سەپێنین بەسەردا، ئەوا ئەمجارەیش (بزرکان) پەیدا دەبێتەوە.

### ٨/١: بەرەنجامی پێشکەوتوو:

وەك بەرەنجامێکی پێشکەوتوو (٢٠١٦)، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە بنج و بنچینەوە بە داپۆشراوی ڕسکاوە، چونکە لە گیرفانی شەش جێناودایە. ئەم بارە داپۆشراوە تەنها هەر فۆرمی فۆنەتیکی دەگرێتەوە، بەلام فۆرمە لۆژیکیەکەی زۆر ڕوون و ئاشکرایە. لە سەرپاکی زمانەکەدا، مۆرفیمی ئێستایی دەچێتە گیرفانی ئەم شەش جێناوەوە (م، یت، ـ، ین، ن، ن) و دیار نامێنێت لە بەر چاوان و جێناوەکانیش دەبن بە ڕێژەی کاری (بـوون).

ئەوەی سەیرە، ئەوەیە کە ئەو جێناوانە دەتوانن مۆرفیمەکە بشارنەوە، بەڵام مۆرفیمەکە ناتوانێت جێناوەکان بشارێتەوە. لە کەسی سێیەمی تاکدا، دەرکەوتنی مۆرفیمەکە لە جێی جێناوەکە، واتای ئەوە نابەخشێت کە مۆرفیمەکە جێناوەکەی داپۆشیوە، چونکە جێناوەکە لە خۆڕسکەوە شووشەیی و نادیارە و مۆرفیمەکەیش لە گیرفانیدا دیارە. لە لایەکی ترەوە، لە بەشی پێنجەمی کتێبی (پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی ـە/٢٠١٥)دا، چەند ڕێژەیەکی نامۆ بە ڕێزمانی ئاسایی، وەك نموونـەکانی (برایـەتی، هەیـەتی، ناردوویـەتی، سەرمایەتی...) خراونەتە بەر شیکار، بەڵام لە پاشتردا (٢٠١٥)، نموونەیەکی دیکەی نامۆ و ناوازە سەری هەڵدا، کە بریتیە لە ڕێژەی (لە خۆیایەتی). لە ئەم نموونەیەیشدا، هەمان جێناوی /ی/ دەبێتەوە بە (پاسابەزێن) و باز دەدات بۆ پاش مۆرفیمی ئێستایی (ـە) و دەنگی خپی /ت/ دەدۆزێتەوە و جووتە دەنگی (تی) بەرهەم دەهێنێت، تا بتوانێت، بە ڕەهایی، بە کۆنترۆڵی زاردا تێ بپەڕێت. ئەوەی ناوازەیە لە ئەم نموونەیەدا، ئەوەیە کە دەتوانین، بە گۆ کردنی دەنگی دالی کلۆرکراو، ئەو پاسابەزێنیەی جێناوی (ی) لاببەین، وەك: (لە خۆیایەتی : لە خۆیدایە). ئەوەی سەیرە، لە دیوی (نەرێ)دا، هەردوو نموونەکە دەبنەوە بە یەکسان، وەك: (لە خۆیایەتی : لە خۆیا نیـە) و (لـە خۆیدایـە : لـە خۆیـدا نیـە). ئەمـە و بـە ئاشـکرا دیـارە کـە لـە نموونـەی یەکەمـدا (لـە خۆیایـەتی) جێناوەکـە پاسـابەزێنە و جووتـەدەنگی (تـی) بەرهـەمهێناوە، کەچـی بـە گـۆکردنی دەنگـی /د/، لـە نموونەی دووەمدا (لە خۆیدایە)، جێناوەکە وازی هێناوە لە (پاسابەزێنی) و لە جێ خۆیدا داساکاوە و بە شێوەی پێنج جێناوەکەی تر ڕیز بـوە، وەك (لـە خۆمایـە، لـە خۆتایـە، لـە خۆمانایە، لە خۆتانایە، لە خۆیانایە). بە کۆی گشتی، جێنـاوی (ی) لـە ئـەو جێیـەدا کـە ئاوێتە دەبێت بە ناوگری /یـ/، وەك (لە خۆیایەتی)، ئەرکە ڕێزمانیەکەی ون دەکات، هەر لە بەر ئەو هۆیە، ئەو پاسابەزێنیە بەرپا دەکات و باز دەدات بۆ خانەی پاشتر و نەفرین دەکات لە خانە ڕەسەنەکەی خۆی. بە ئەم شێوەیە، هۆکاری ئـەو ڕەفتـارە پاسـابەزێنیە یەکلایی دەبێتەوە، چونکە بەس بە گۆکردنی دەنگـی نـەبزوێنی /د/ کێشـەکە چارەسـەر دەبێت. بە کورت و کرمانجی، سەرەداوی ئەم کێشەی (پاسـابەزێنی)یە لـە دەنگسـازیدایە،

چونکە جێناوی (ی) تاکە جێناوە، لە سێتەکەیدا، کە لە یەك (بزوێن) پێکهاتوە و ئەو بزوێنەیش لە جۆری (نیمپەبزوێن)ە، چونکە پێگەکەی گلانیە و بە پێی ژینگە دەنگسازییەکە دەگلێت بە دیوی بزوێندا، یان بە دیوی نەبزوێندا. سەرەڕای ئەوەی گوترا، لە چەند نموونەیەکدا، وەك ئەوانەی خوارەوە، هەندێك شرۆڤە و شیکاری ورد هەیە، کە دەشێت جوانتر و سفتتر شی بکرێنەوە، وەك:

(١): من ئەم هێناوە

(٢): من ئەم هێناویت

(٣): من تۆم نە هێناوە

(٤): من ئەم هێناوەتەوە

(٥): من ئەم هێناویتـەتەوە

(٦): من تۆم نەهێناوەتەوە

یەکەم: لە رستەی (١)دا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە جوانی دەرکەوتوە لە جێی جێناوی نادیاری (بەرکار).

دوەم: لە رستەی (٢)دا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە جوانی داپۆشراوە بە جێناوی بەرکار (یت).

سێیەم: لە رستەی (٣)دا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە جوانی دەرکەوتوە لە جێی جێناوی بەرکار (یت)، چونکە رێزمانەکە رێ دەدات، کە جێناوی لکاوی بەرکار (یت) بکرێت بە جێناوی جودای بەرکار (تۆ).

چوارەم: لە رستەی (٤)دا، بە زەبری بزوێنی (ە)، لە پاشگری دووپاتیدا (ەوە)، روخساری مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، لە رستەی (١)دا، گۆڕاوە بە روخساری (ـەت) لە رستەی (٤)دا.

پێنجەم: لە رستەی (٥)دا، بە زەبری بزوێنی (ە)، لە پاشگری دووپاتیدا (ەوە)، مۆرفیمی ئێستایی، داپۆشراو بە جێناوی بەرکار (یت)، دەرهێنراوەتە دەرەوە بە روخساری (ـەت) و لە گەڵ جێناوە داپۆشەرەکەی ریز بوە، وەك: (یتـــەت).

شەشەم: لە ڕستەی (٦)دا، بە زەبری بزوێنی (ە)، لە پاشگری دووپاتیدا (ەوە)، مۆرفیمی ئێستایی ئاشکراکراو لە ژێر جێناوی بەرکار (یت)، گۆڕاوە بە (ـەت).

هەفتەم: لە هەر سێ بارەکەی مۆرفیمی (ـە)دا (ئاشکرا، داپۆشراو، ئاشکراکراو) لە ڕستەکانی (١، ٢، ٣)دا، زەبری بزوێنی (ـە) هەر روخساری (ـەت)ی دۆزیوەتەوە، وەك ڕستەکانی (٤، ٥، ٦). ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە (١): دەنگی خپی /ت/ هەیە لە روخساری مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دا، (٢): سێتەجێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) گشت کاتێك روخساری مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەشارێتەوە.

پەراوێز و سەرچاوە:

١- ئەمە یەکەم جار نیە کە ئێمە باسی مۆرفیمی ئێستایی دەکەین و دەڵێین بە جێناوەکانی سێتی یەکەم (م، یت، ـە، ین، ن، ن) دادەپۆشرێت. تەنانەت نووسینێکمان بڵاوکردۆتەوە، بەناونیشانی (جێناوی سادە و جێناوی ناسادە)، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٥٠)، هەولێر، ٢٠٠٠.

٢- مامۆستای بەڕێز د. ڕەفیق شوانی، لە ژمارە (١٦٦ / ٢٠٠٢)ی گۆڤاری کارواندا نووسینێکی درێژی نووسیوە، لە ژێر ناونیشانێکی زۆر زل و قەبەدا (لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکانم دەربارەی...) و بە دەسپێکێکی زۆر سەیر، وەك خۆی دەڵێت (هەڵەی نازانستی) لە جیاتی (هەڵەی زانستی). ئەمە و بەداخەوە، مامۆستا زۆر زوڵمی لە خۆی کردوە و نووسینێکی نازانستی نووسیوە لە سەر بابەتێك کە هیچی لێ تێ نەگەیشتوە. بە هیواین مامۆستا جارێکی دی بابەتەکە بخوێنێتەوەو لە ئەم شرۆڤەکارییە زانستییە تێ بگات، یان داوا لە ئێمە بکات و ئێمەش بە سوپاسەوە، ئامادەین تێی بگەیەنین. ئەوسایش بۆی هەیە کە ڕەخنەی بابەتی و پتەو بنووسێت و ئێمەش ئامادەین وەڵامی بدەینەوە، هەر بۆ نموونە، مامۆستا ئەم بابەتەی بە (ڕەها)داناوە، ئێمەش وا بابەتەکە دەگەین بە ئەم نووسینە فراوانە و بەهیواین کەڵکی هەبێت بۆ توێژەرانی ڕێزمانی کوردی.

٣- کەڵك وەرگیراوە لە نووسینێکی (د. وریا عومەر ئەمین)، بە ناونیشانی لێکۆڵینەوەیەکی مۆرفۆفۆنیمی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژمارە (٢٩ - ٣٠)، بەغدا، ٢٠٠٢.

# بابەتی دووەم

# روخساری مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە بەڵگە[٢]

## ٢/١: دەستپێك:

زۆرجار دەبینین و دەبیستین کە هەندێك کەس باوەڕی بە ئەم بنەمایەی ئێمە نیە(١): {روخساری رەسەنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بریتیە لە (ـەت). واتە دەنگێکی خپ لە چەشنی /ت/ هەڵ دەگرێت و ئەو دەنگە تەنها و تەنها بە زەبری بزوێن لە خپ بوون دەرباز دەبێت و گۆ دەکرێت}.

تا ئەمرۆ (٢٠١٦/٣/٧)، ئێمە لە ئەم بنەمایەی خۆمان پەشیمان نین و رۆژ بە رۆژ پتر کاریگەری دەردەخات و جوانتر دەچەسپێت لە ئەو شیتەڵکاریە زانستیەدا، کە ئێمە لە رێزمانی کوردییدا دەستمان پێکردوە. ئێمە بە هیچ جۆرێك رەخنە لە ئەو کەسانە ناگرین کە باوەڕ ناکەن بە ئەو بنەمایە، چونکە ئەوە مافی رەوای خۆیانە، کە تێ نەگەن و پەسەندی نەکەن. تەنانەت، ئەگەر بڵێین: ئەو دیاردە بە رەهایی باسکراوە، مافی خۆیانە و رەخنەیەکی جوانە. جۆرە رەخنەی ئاوها زۆر زۆر سەلارتر و بەبرشت ترە لە ئەوەی کە نووسینێکی دوورودرێژ و پڕ لە رەخنەی وێران و نابابەتی بڵاوبکرێتەوە. لە ئەو هەڵوێستەیشدا کە بڵێن: بە (رەهایی) باسکراوە، ئێمە دەکەوینە بەر رەخنەیەکی جوان و دووچاری ئەوە دەبین کە بابەتەکە روونتر بکەینەوە و ئەو پێزەی تێ بکەین کە خوێنەری ئازیز بە ئاسانتر لێی تێ بگات، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئێمە چەند خاڵێك دەخەینەڕوو بۆ

---

[٢] گۆڤاری (نووسەری نوێ). ژمارە (٢١/ ٢٠٠٤). لا (٨٦ ـ ٩٨).

ڕەخنەگرانى ئازیز و ئەو هۆیانە ڕوون دەكەینەوە كە دەبێت بە هۆى نیگەرانى لە تێگەیشتنى ئەو بنەمایەدا:

یەكەم: نووسینەكانى ئێمە جیاوازە لە نووسینى ڕێزماننووسانى دى و خوێنەریش بە بڕشتى ڕێزمانى نووسراوەوە ڕوو دەكات لە بابەتەكە. بەواتایەكى دى، ئەو ڕێزمانەى كە ئێستا دەخوێنرێت و جێى خۆى گرتوە، دادى ئێمە نادات و ئێمە هەندێك شیتەڵكارى پێشكەوتوو دەهێنینە كایەوە، كە دەكەوێتە دەرەوەى ئەو ڕێزمانە. كەواتە، ڕێزماننووسان زێڕى زمانەكەى خۆیان ناناسنەوە و لە دەرەوەى ڕێزمانى زمانانى تردا هەموو بابەتێكى ڕەسەنى زمانى كوردى بە (ڕەها) دەناسن، ئەگەر مۆركیش بێت.

دووەم: خوێنەرى ئازیز خۆى كەمتەرخەمە لە خوێندنەوەدا، چونكە لە هەمان جێدا كە ئەو بابەتە باس دەكرێت، چەندین بەڵگە و شیتەڵكارى دەخرێنە ڕوو، تەنانەت لەچەندین جێدا و لە چەندین نووسیندا ئەو بابەتە دووبارە كراوەتەوە و خۆیشمان بێزاربووین لە دووبارەكردنەوەى. خوێنەرى ئازیز خۆى دەتوانێت ئەو كتێب و نووسینانە بخوێنێتەوە و ئەوجا بەرێك و پێكى دەمى ڕەخنە بكاتەوە.

سێیەم: بابەتەكەى ئێمە پێویست بە ئەوە دەكات كە خوێنەرى ئازیز كاغەز و پێنووس هەڵ بگرێت و ڕەشنووسێك دروست بكات، بۆ ئەوەى بتوانێت بیر و بۆچوونەكانى بە وردى تۆمار بكات و زانیارییەكان لە نەخشەیەكدا كۆبكاتەوە. لە ئەم ڕووەوە، ئێمە لە چەندین جێدا، بە ئەو چەشنە ڕوونى دەكەینەوە و چەندین مامۆستاى بەهرەمەندیش بە ئێمەیان گوتوە كە ئاوەها دەى خوێننەوە.

چوارەم: لەبەر ڕووناكى خاڵى پێشوو، خوێندنەوەى سادە و ساكار دادى ئەو بابەتە نادات و دەبێت لە جیاتى ئەوەى (بخوێنرێتەوە)، خوێندن و كۆششى تێدا بكرێت.

پێنجەم: لەبەر ئەوەی بە بڕشتی لێکۆڵینەوە و بە شرۆڤەکاری زانستی بابەتەکە قوول دەکەینەوە و لێکی دەدەینەوە، هەر جارێك لەسەر خاڵێکی بچووك ڕادەوەستین. لە هەلوێستی ئاوهادا بۆ ئەوەی لە (بابەت) دەرنەچین و خزمەتێکی جوان پێشکەش بکەین، ناتوانین ئەو بابەتە روون بکەینەوە کە لەگەڵ خاڵی لێکۆڵینەوەکەدا یەکتری دەبڕن، بێگومان، ئەو جۆرە بابەتە لاوەکیانە خوێندنەوەیان دەوێت و دەبێت خوێنەری ئازیز خۆی بۆ ببەستێت، تا بە هوردی و بە سفتی لە کاکڵەکەی تێ بگات.

**٢/٢: روخساری (ـەت) بە بەڵگە:**

لە پاش ئەو روونکردنەوەیە، جارێکی دیکە دەست دەکەینەوە بە ڕاڤەکردنی بابەتەکە و چەندین بەڵگە ریز دەکەین، کە دەی سەلمێنن، کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لەرەسەندا بریتیە لە (ـەت)، وەك:

بەڵگەی یەکەم:

لە هەر جێیەکدا، کە ڕێزمانەکە ڕێ بدات کە بزوێنێکی ڕاستەوخۆ بخشێت لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە کلکەوە، دەنگی کۆنسۆنانتی /ت/ پەیدا دەبێت، وەك:

یەکەم: خشاندن لە پاشگری دووپاتکردنەوە (ەوە)، وەك:

رۆیشتوە: رۆیشتوەتەوە

دوەم: خشاندن لە ئامرازی پەیوەندی (ـە)، وەك:

رۆیشتوە: رۆیشتوەتە ئەوێ

سێیەم: خشاندن لە ئامرازی (ێ)، وەك:

گەیشتوە: گەیشتوەتێ

لە ئەم بەڵگەیەدا، ئێمە چەندین و ڕێزماننووسی تر دەڵێین: ئەو دەنگە ڕۆڵی ناوگر دەبینێت لە نێوان دوو (بزوێن)دا، بۆ ئەوەی لەیەکتری نەخشێن بە ڕاستەوخۆیی. باشە ئێمە وا دەڵێین و ئەو مامۆستایانەش کەوا دەڵێین، ڕاست دەکەن، بەڵام نابێت بزانین ڕەسەن و بنچینەی ئەو دەنگە لە کوێوە دەست پێدەکات، ئایا ئەو دەنگە لە دەرەوەی قەوارەی ئەو دوو ڕەگەزەوە پەیدا بوو، کە لێك خشاون، یان لە ناوەوە؟ لە ئەم ئاستەدا، زۆر پێویستە ڕێزماننووس کێشەکە یەکلایی بکاتەوە و بیر بگوشێت و چرایەك لە ئەو بۆشاییە تاریکەدا هەڵ بکات.

بەڵگەی دووەم:

وەك ڕێزماننووسان دەڵێن و ئێمەش لەگەڵ ئەوان هەروا دەڵێین، کێشەی پەیدا بوونی دەنگی /ت/ بریتیە لە کێشەیەکی دەنگسازی. لە ئەم هەڵوێستەدا، ئەدی بۆچی دەنگێکی دی پەیدا نەبوە بۆ ئەو ناوگریە، خۆ هەر دەنگێکی (نەبزوێن) دەتوانێت ئەو کێشە دەنگسازییە چارەسەر بکات. بۆ نموونە دەنگەکانی (ب، پ، ل، ك، د، ت، هـ...) دەتوانن ئەو ئەرکە دەنگسازیە چارەسەر بکەن، وەك:

رۆیشتو: رۆیشتوبەوە*

لە ئەم ئاستەدا هەموو ڕێزماننووسێك تێ دەگات، کە لە ڕوانگەی دەنگسازیەوە کێشەکە چارەسەرکراوە بە دەنگی نەبزوێنی (ب)، بەڵام ڕستەکە لە ڕووی ڕێزمان و واتاوە بزرکاوە. کەواتە هیچ دەنگێکی دی، بێجگە لە /ت/، دادی مۆرفیمی ئێستایی نادات. ئەمەیش خۆی لە خۆیدا بریتیە لە بەڵگەی ئەوەی کە دەنگی /ت/ هی خۆیەتی، یان موڵکی خۆیەتی. چونکە ئەگەر کێشەکە بریتی بێت لە (دەنگسازی) و بەس، ئەوا زۆر دەنگی تر ئەو کێشەیە یەکلایی دەکەنەوە.

بەڵگەی سێیەم:

لە چەشنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ڕەگەزێکی ڕێزمانی دی هەیە، کە هەمان ڕوخساری هەیە. ئەو ڕەگەزە بریتیە لە جێناوی (بکەر) لە ڕێژەی فەرماندا (ـە). ئەوەی سەیرە، ئەم ڕەگەزە ئەگەر بزوێنێك بخشێت لە کلکەکەی، لەجیاتی دەنگی /ت/، دەنگی /ر/ی سووك زیندوو دەکاتەوە، وەك:

تۆ بکەو (ە-) : تۆ بکەو (ەر)ەوە

تۆ بکەو (ە-) : تۆ بکەو (ەر)ـە سەری

تۆ بگە (ە-) ئەو : تۆ بی گە (ەر)ێ

لە ئێرەدا، دەردەکەوێت کە بزوێنی (ـە) لە ڕێژەی فەرماندا، پڕ بە پڕ جیاوازە لە بزوێنەکەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە). لەجۆرە هەڵوێستی ئاوهادا، ئەگەر هەردوو دەنگی /ت/ و /ر/ ناوگر بن، دەشێت بیانگۆڕینەوە بە یەکتری، بەڵام ئەوە نابێت. لە ئەم ئاستەدا، دەبێت بە (تەرخانکردن) جودایان بکەینەوە و دەنگی /ت/ تەرخان بکەین بۆ مۆرفیمی ئێستایی (ـە) و دەنگی /ر/ تەرخان بکەین بۆ جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە). ئەمەیش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکە بۆ ئەو ڕاستیەی کە ئەو دوو دەنگە بریتین لە ناوگرێکی تایبەتی لە گیرفانی ئەو دوو مۆرفیمەدا. یان ئەو دوو دەنگە بریتین لە بەشێك لە پێکهاتەی بنچینەیی لە ئەو دوو ڕەگەزەدا. بەڵگەیش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هیچ دەنگێکی تر دادی ئەو دوو ڕەگەزە نادات و ئەو دوو ڕەگەزەیش ناتوانن ناوگرەکانیان ئاڵوگۆڕ بکەن.

بەڵگەی چوارەم:

بەشێوەیەکی ئاسایی، دەنگی /ی/ی نەبزوێن ڕۆڵی (ناوگرایەتی) دەبینێت. بۆ نموونە لەنێوان دوو دەنگی بزوێنی (ـە)دا، دەنگی /ت/ دەبێت بە ناوگر، وەك:

(رۆیشتووەتەوە)، کەچی لە نێوان دوو بزوێنی دیدا، لە هەمان چەشنی (ـە)، دەنگی (ی) دەبێت بە ناوگر، وەك: (ئەوەیە). لە ئەم نموونەیەی دواییدا، ناوگرێکی دەرەکی پەیدا بوە. کەچی لە دوو نموونەکەی دیدا، ناوگرێکی تایبەتی و ناوەکی پەیدا بوە. لە بەر رووناکی ئەم نموونەیە، رێزماننووسان نابێت بە دەسخەرۆیی لە ئاستی (ناوگر)دا بوەستن، چونکە لە سەرووی ناوگرەوە، بیروبۆچوونی دی هەیە. بە واتایەکی دی، ناوگریش لە نێوان خۆیاندا پۆلێن دەکرێن، وەك (ناوگری ناوەکی) لە ناوەوەی قەوارەکە و (ناوگری دەرەکی) لە دەرەوەی قەوارەکە.

بەڵگەی پێنجەم:

وەك رێزماننووسان هیچ رێگایەکیان نیە و لەگەڵ مۆرفیمی ئێستاییدا دەنگی /ت/ تەرخان دەکەن بە (ناوگر) و لەگەڵ جێناوی رێژەی فەرمان دەنگی /ر/ دەکەن بە ناوگر، هیچ چارەسەرێك نامێنێت تەنها و تەنها مەگەر بڵێین: ئەو دەنگانە بریتین لە دوو دەنگی خپکراو لە قەوارەی ئەو دوو رەگەزە رێزمانیەدا.

بەڵگەی شەشەم:

وەك بەڵگەیەك بۆ بەخشینی نازناوی (خپ)، بە واتای (Silent)، بە دەنگی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا، دەتوانین بە ئاشکرا ببینین کە ئەو دەنگە هەر بە زەبری بزوێن زیندوو دەبێتەوە بەبێ ئەو زەبرە بە رادەی (١٠٠٪) خپ دەبێت.

بەڵگەی هەفتەم:

لە هەر جێیەکدا کە /ت/ زیندوو بووبێتەوە (بە زەبری بزوێن)، ئاڵوگۆڕکردنی ئەو دەنگە دەبێت بە هۆی (ناڕێزمان). لە هەمان کاتدا، لابردن و گۆنەکردنی ئەو دەنگە دەبێت بە (ناڕێزمان) و دەبێت بەهۆی پەیدابوونی کلۆریەك لە قەوارەی مۆرفیمەکەدا.

بەڵگەی هەشتەم:

لەبەڵگەی یەكەمدا سێ نموونە ڕیزكراون و هەر یەكێكیان خشێنرابوو لە ڕەگەزێكی ڕێزمانی جیاواز، كەچی لەهەر سێ نموونەكەدا هەر دەنگی /ت/ پەیدا بووبوو. ئەمەیش چەند سەرنجی گەورەی تێدا هەیە:

یەكەم: لە هەر سێ ڕەگەزەكەدا، دەنگی /ت/ دەركەوتوە و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە دەنگی /ت/ لە بنچینەی مۆرفیمی ئێستایی بێت، نەك لە ئەو بزوێنانەی كە لە كلكی خشاون.

دووەم: وەك ئەو سێ ڕەگەزە هەر دەنگی /ت/یان بووژاندوەتەوە، دەشێت بڵێین (ئەم ماستە مووێكی تێدایە)، واتە ئەو دەنگە ڕەسەنە بریتیە لە بەشێك لە مۆرفیمی (ـە).

سێیەم: ئەگەر ئەو سێ ئامرازە بخشێنین لە جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە)، ئەوا لە هەر سێ بارەكەدا، هەر دەنگی /ر/ زیندوو دەبێتەوە (بەڵگەی سێیەم). كەواتە، پەیدابوونی دوو دەنگی جیاواز بریتیە لە كێشەیەكی فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی پێكەوە، كە پێی دەگوترێت (مۆرفۆنیمی)[٣].

بەڵگەی نۆیەم:

لە ئەم دوو نموونەیەدا سەرچاوەی ناوگرەكان دیارە، وەك:

ئامرازی (ێك) : پیاوێك: پیاوێـ (-)

جێناوی (ێت) : دەنووسێت: دەنووسێـ (-)

ئێستا، ئەگەر زەبری بزوێن بچەسپێت، دەنگی ڕەسەنی /ك/ و /ت/ دەبووژێنەوە بۆ (ناوگرایەتی)، وەك:

له (پیاوێ) + ەوە : له پیاوێکەوە

(دەنووسێ) + ەوە : دەنووسێتەوە

له ئاستی ئەو نموونانەدا، هەموو کەسێك دەزانێت و زۆر ئاشکرایە کە ئاگرەکە دەرەکی نیە و ئاوەکیە و بەشێکە لە ڕەگەزی (ێك) و جێناوی (ێت). لە ئەم هەڵوێستەدا، وەك بنچینەی دەنگی (ك) و دەنگی /ت/ ئاشکرایە، دەتوانرێت هەر هەشت بەڵگەکەی سەرەوەی بەسەردا بچەسپێت. ئەدی بۆچی پەڵپ بگرین لە دەنگی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا و بڕ و بیانوو بهێنینەوە و بڵێین: بەشێك نیە لە ڕوخساری مۆرفیمەکە. لە هەڵوێستی ئاوهادا، هەموو بەڵگەکان دەبن بە شایەت بۆ ئەوەی بگوترێت: ڕوخساری بنەڕەتی مۆرفیمی ئێستایی بریتیە لە (ـەت)، وەك هەردوو ڕەگەزی (ێك) و (ێت). تەنها جیاوازیش ئەوەیە کە دەنگی /ت/ بە تەواوی خپە لە مۆرفیمی ئێستاییدا، بەڵام لە دوو ڕەگەزەکەی تردا نیمچە خپە، چونکە دەتوانرێت بەبێ زەبری بزوێن گۆ بکرێن.

بەڵگەی دەیەم:

لە ئەم نموونانەی خوارەوەدا:

من نووسرام : (ڕابردووی نزیك)

من دە نووسرام : (ڕابردووی بەردەوام)

من نووسرا بووم : (ڕابردووی دوور)

من نووسراوم : (ڕابردووی تەواو)

تەنها لە نموونەی چوارەمدا، شەبەنگی واتای مۆرفیمی ئێستایی هەیە، چونکە لە دەمکاتی (ڕابردووی تەواو)دایە و مۆرفیمەکە لە ژێر جێناوی (م)دا شاردراوەتەوە. ئێستا

ئەگەر ئەو چوار نموونەیە بخشێنین لە بزوێنێك، دەبینین لە سێ نموونەکەی سەرەتادا جێناوی (م) ڕۆڵی ناوگر دەبینێت و دەبێت بە (مـە)، بەڵام لە نموونەی چوارەمدا مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەهێتە دەرەوە، وەك:

من نووسرا مەوە

من دەنووسرامەوە

من نووسرابوومەوە

من نووسراومەتەوە

لە ئێرەدا، بابەت ئەوە نیە کە مۆرفیمی ئێستایی دۆزراوەتەوە، بابەت ئەوەیە بزوێنی (ـە) لە جێناوی (م)دا بۆ مۆرفیمی (ـە) نەگەڕاوە، بەڵام لە دەنگی /ت/ خشاوە و مۆرفیمی ئێستایی ڕاکێشاوەتە دەرەوە. کەواتە، ئەگەر دەنگی /ت/ بەشێك نەبا لە مۆرفیمەکە، بزوێنی (ـە) نەی دەتوانی مۆرفیمی ئێستایی (ـەت) لە داپۆشین دەرباز بکات. بەواتایەکی دی، ئەگەر کێشەکە هەر فۆنۆلۆژیانە با، ئەوا بزوێنی (ـە) دەخشا لە جێناوی (م)، وەك سێ نموونەی سەرەتا و کێشەکە چارەسەر دەبوو بە بڕگەی (مە). بەڵام کێشەکە لە جۆری فۆنۆلۆژی - مۆرفۆلۆژیە، چونکە بە سایەی دەنگسازیەوە، مۆرفیمێك لە داپۆشین دەرباز بوە و لە ڕیزی سنتاکسی خۆیدا بە ڕاشکاوی دانیشتوە. ئێمە لە ئەو باوەڕەداین، ئەگەر مۆرفیمی (ـە) دەنگی /ت/ی پێوە نەبا، ئەوا بزوێنەکەی پاشگری (ەوە) پێویستی پێ نەدەبوو.

۲/۳: مۆرفیمی (ـە) لە ڕووبەرەکانی زمانەکەدا:

ئێمە لە هەموو جێیەکدا گووتومانە: مۆرفیمی (ـە) لەدوو ڕووبەردا هەیە، کە بریتین لە:

یەکەم: ڕانەبردووی ئێستایی، واتە ڕانەبردووی (بوون و هەبوون)

دوەم: رابردووی تەواو، واتە سەرپاکی رووبەری رابردووی تەواو

له ئەم دوو رووبەرەیشدا، مۆرفیمی (ـە) لە گەڵ دوو ئەرکی جێناودا هەیە، وەك:

یەکەم: ئەرکی (بکەر) لە ڕێژەی تێنەپەڕدا

دوەم: ئەرکی (بەرکار) لە ڕێژەی تێپەڕدا

کەواتە دەتوانین رووبەرەکانی مۆرفیمی ئێستایی دابەش بکەین بەسەر چوار جۆردا، وەك:

یەکەم: رووبەری رانەبردووی تەواوی تێنەپەڕ، وەك:

من برا (م) : تۆ برا (یت) : ئەو برایـ (ـە)

ئێمە برا (ین) : ئێوە برا (ن) : ئەوان برا (ن)

لە ئەو ریزەدا، مۆرفیمی (ـە) تەنها لە کەسی سێیەمی تاك دەرکەوتوە، چونکە جێناوی ئەو کەسە نادیارە و لە کەسەکانی دیدا جێناوەکان دیارن و مۆرفیمەکەیان داپۆشیوە. بەڵام ئەگەر جێناوی خاوەنیەتی بکەین بە سەربار، لە رستەی سێیەمدا (ئەو برایە) دەتوانین دەنگی /ت/ بە ئاشکرایی ببینین، وەك:

ئەو برا (م) (ـە)

ئەو برا /ت/ (ـە)

ئەو برایـ (  ) ([redacted])ی

ئەو برا (مان) (ـە)

ئەو برا (تان) (ـە)

ئەو برا (یان) (ـە)

له ئەو ریزه جێناوەدا (م، ت، ی، مـان، تـان، یـان)، جێنـاوی (ی) یاسا بەزێنـه و بەبێ بازی جێگۆڕکێ داناساکێت. هەر لەبەر ئەوە، باز دەداته پاشەوەی مۆرفیمی (ـه) و دەنگی /ت/ زیندوو دەکاتەوە، بۆ چێکردنی برگەی (تی). بێگومان، ئەمەیش بریتیه لـه وەلامی ئەو مەتەڵەی که ڕێزماننووسانی له خشته بردوه و هەر یەکێك به جۆرێك لێکی دەداتەوە. ئەمه و ئێمه و ئەوان له ئەوەدا یەك دەگرینەوە که دەنگی /ت/ له ئەو جێیەدا بوه به ناوگری دوو بزوێن (ـه، ی)، بەلام له لای ئێمه (له تیۆری زەبری بزوێندا) مژاری (ناوگر) پێناسەیەکی تری هەیه.

دوەم: ڕووبەری ڕانەبردووی تەواوی تێپەڕ، وەك:

ئەو (ئەم)ی هەیه : ئەو هەیـ (ـەت)ی

له نێرەشدا، جێناوی (بکەر)، که بریتیه له (ی)، یاسا بەزێنی نوواندوه و بـازی داوەته پاش مۆرفیمی ئێستایی (ـه) و دەنگی /ت/ زیندوو کردوەتـەوە. کەواتـه، لـه ئـەم ڕووبەرەیشدا دەنگی /ت/ به مۆرفیمی ئێستاییەوە هەیه.

سێیەم: ڕووبەری ڕابردووی تەواوی تێنەپەڕ، وەك:

من نێردراو (م) : من نێردراو (م) (ـەت)ەوە.

تۆ نێردراو (یت) : تۆ نێردراو (یت) (ـەت)ەوە.

ئەو نێردراو (ە) : ئەو نێردراو ( ) (ـەت)ەوە.

ئێمه نێردراو (ین) : ئێمه نێردراو (ین) (ـەت)ەوە.

ئێوه نێردراو (ن) : ئەوان نێردراو (ن) (ـەت)ەوە.

ئەوان نێردراو (ن) : ئەوان نێردراو(ن) (ـەت)ەوە.

بە سەرنجی ورد لە ئەو نموونانە، دەتوانین ئەم راستیانە ببینین:

ـ لە کەسی سێیەمی تاکدا مۆرفیمی (ـە) بە زەبری بزوێنەکەی پاشگری دووپاتکردنەوە بوە بە (ـەت).

ـ لە پێنج کەسەکەی تردا، مۆرفیمەکە لەژێر جێناوەکە دەرهێنراوە و بە روخساری (ـەت) دەرکەوتوە.

ـ لە هەر شەش رستەکەدا مۆرفیمی (ـە) بە دەنگی /ت/ رازاوەتەوە.

چوارەم: رووبەری رابردووی تەواوی تێپەڕ، وەك:

ئەو (ئەم)ی ناردوە : ئەو ناردوو (ـەت)ی

لە ئەم نموونەیەدا، بە راستەوخۆیی جێناوی (ی) خشاوە لە کلکی مۆرفیمەکە و دەنگی /ت/ی هێناوتە گۆکردن، پاشان دەتوانین لە نموونەیەکی تردا بۆی بگەڕێین، وەك:

من (ئێوە)م ناردوە : من ناردوو (م) (ن)

لەئێرەشدا، دەتوانین (زەبری بزوێن) بخەینە کار، بۆ ئەوەی لە رستەی دوەمدا، دەنگی /ت/ بدۆزینەوە، وەك:

من (ئێوە)م ناردوو (ـەت)ەوە

لەرستەی یەکەمدا دەتوانین (زەبری بزوێن) بخەینەکار و قەوارەی مۆرفیمەکە (ـەت) لەژێر جێناوی (ن) دەربهێنین بە راکێشان، وەك:

من ناردوو (م) (ن) : من ناردوو (م) (ن) (ـەت)ەوە

لەکۆتایی ئەم کۆپلەیەدا، دەتوانین دوو سەرنج بخەینەڕوو، وەك:

یەکەم: لەهەر چوار ڕووبەرەکەدا، کە تەنها هەر ئەو ڕووبەرانە مۆرفیمی ئێستایی دەگرنەخۆ، مۆرفیمەکە بە ڕوخساری (ـە) پیشاندرا و ڕوخساری (ـەت)یش بە تیۆری (زەبری بزوێن) پیشاندرا.

دووەم: لەهەر چوار ڕووبەرەکەدا، واتە لە هەموو زمانەکەدا، دەنگی /ت/ دۆزرایەوە بە زەبری بزوێن. تۆ بڵێیت ئەمەیش نەبێت بە بەڵگەیەکی دی کە دەنگی /ت/ بریتیە لە بەشێك لە ڕوخساری مۆرفیمی ئێستایی.

### ٤/٢: بەرەنجام و پوختەکاری:

مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەنگێکی (خپ)، لە چەشنی /ت/، هەڵ دەگرێت. واتە، لە بنج و بنەڕەتدا ڕوخساری مۆرفیمەکە بریتیە لە (ـەت).

لەرووی بەڵگەسازییەوە، ئەم بەڵگانەی خوارەوە دەی سەلمێنن کە ڕوخساری ڕەسەنی مۆرفیمی ئێستایی بریتیە لە (ـەت):

یەکەم: لە هەر جێیەکدا کە ڕێزمانەکە ڕێ بدات بە خشاندنی دەنگێکی (بزوێن) لە مۆرفیمەکە، بە ڕوخساری (ـەت) دەردەکەوێت.

دووەم: لە هەر جێیەکدا کە ناوەڕۆکی خاڵی یەکەم بچەسپێت، ناتوانین دەنگێکی دی بخەینە جێی دەنگی /ت/. کەواتە، کێشە هەر فۆنۆلۆژی نیە، چونکە هیچ دەنگێکی تر پەسەند ناکات، هەرچەندە ئەو دەنگە بتوانێت کێشە فۆنۆلۆژییەکە چارەسەر بکات.

سێیەم: ئەگەر دەنگی /ت/ هەر ناوگر بێت و بەس، ئەدی بۆچی لە ڕێژەی فەرماندا جێناوی (ـە) دەبێ بە (ـەر). کەواتە، ئەو دوو مۆرفیمە دەنگی تایبەتی خۆیان هەیە لە فۆرمی فۆنەتیکیدا.

چوارەم: ناوگرێکی دەرەکی هەیە بۆ ناوبڕیوانی لە نێوان دوو بزوێن کە بریتیە لە دەنگی /ی/. ئەی بۆچی لە ئێرەدا ئەو ناوگرە بڕەوی نیە و (ناڕێزمان) پەیدا دەبێت.

پێنجەم: وەك مۆرفیمی ئێستایی (ـە) و جێناوی ڕێژەی فەرمان (ـە) بە زەبری بزوێن دەبن بە (ـەت) و (ـەر)، ڕێزماننووسان هیچ چاریان نیە و دەبێت بڵێین: هەر یەکێك لە ئەو دوو ڕەگەزە ناوگری تایبەتی خۆی هەیە. ئەمەیش هەر وەك ئەوە وایە کە بڵێیت: هەر دوو ڕەگەزەکە دەنگی خپیان هەیە و ئەو دەنگە بە (زەبری بزوێن) زیندوو دەبێتەوە.

شەشەم: زیندووبوونەوەی دەنگی /ت/ بە زەبری بزوێن گشتیە لە سەرپاکی رووبەری زمانەکەدا. ئەو راستیە هیچ گفتوگۆیەك هەڵ ناگرێت. ئەمەیش بەڵگەیەکە بۆ هەبوونی دەنگی /ت/ وەك دەنگێکی بنچینەیی و خپ لە روخساری فۆنەتیکی مۆرفیمەکەدا.

حەفتەم: لە هەر جێیەکدا کە دەنگی /ت/ زیندوو بووبێتەوە و ئێمەش لای ببەین، یان (نارێزمان). یان (کلۆری) پەیدا دەبێت لە ریزی نموونەکەدا. ئەو نارێکییەیش بەدیاریکراویش لە قەوارەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)دایە.

هەشتەم: میکانیزمی (زەبری بزوێن) لە سێ ڕەگەزی جیاوازدا چەسپێنراو لە هەر سێ بارەکەدا هەر یەك دەنگ پەیدابوو /ت/. کەواتە، ناوگرەکە لە پێکهاتەی مۆرفیمەکەدایە و هی مۆرفیمەکەیە.

نۆیەم: بەرانبەر بە دەنگی /ت/ لە مۆرفیمی ئێستاییدا، لە ڕەگەزی (ێك)دا دەنگی (ك) هەیە و لە جێناوی (ێت)دا دەنگی /ت/ هەیە. ڕەسەن و بنچینەی ئەو دوو دەنگە ئاشکرایە و ئەو دوو دەنگە بە بەڵگەکانی نێو ئەم نووسینە دەدۆزرێنەوە. ڕێزماننووسانیش دەتوانن ئەو دەنگە بکەن بە (پێوانە) بۆ ئەوەی ڕەسەن و بنچینەی دەنگی /ت/ بدۆزنەوە، کە بریتیە لە بەشێك لە مۆرفیمی ئێستایی (ـەت).

دەیەم: لە ژێر سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن)دا، لە رووبەری رانەبردووی بوون و هەبوون و رابردووی تەواودا، مۆرفیمی ئێستایی هەیە. کاتێك کە دەنگی (بزوێن)

دەخشێت لە ئەو جێناوانە، مۆرفیمەکە دەردەهێنرێتەوە. دەباشە، مۆرفیمەکە خۆی لە ڕیزەکەدا نیە و زەبری بزوێنەکەیش بۆ دەنگێکی (نەبزوێن) دەگەڕێت، ئەدی ئەگەر دەنگی /ت/ پارچەدەنگێك نەبێت لە مۆرفیمەکەدا، چۆن دەتوانێت مۆرفیمەکە را بکێشێت و چۆن دەتوانێت بی دۆزێتەوە.

وەك چۆن، لە سەر پاکی ئەو ڕووبەرانەدا، کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) هەیە، دەنگی /ت/ دۆزرایەوە، دەتوانین بڵێین: دەنگی /ت/ بریتیە لە دەنگێکی بنچینەیی لە روخساری مۆرفیمی ئێستاییدا.

ڕێزماننووسان دەڵێین: دەرکەوتنی دەنگی /ت/ بریتیە لە دیاردەیەکی (فۆنۆلۆژی) و ئیتر بابەتەکە قفڵ دەدەن و نازانن کە بابەتەکە لە ئەوە زۆرتری بەدەمەوەیە، لە (تیۆری زەبری بزوێن)دا.

ڕێزماننووسان دەڵێن: دەنگی /ت/ ناوگرە و بەس. ئێمەیش دەڵێین: ئەو ناوگرە تایبەتە بە مۆرفیمی ئێستایی. بە شێوەیەکی تر دەتوانن بڵێین: بریتیە لە دەنگێکی خپ لە بنیادی مۆرفیمی ئێستاییدا.

سەرەڕای ئەوەی گوترا، لە هیچ جێیەکی تری زمانەکەدا دەنگی /ت/ دەرنەکەوتوە بۆ (ناوگرایەتی)، تەنها لەمۆرفیمی ئێساییدا نەبێت، واتە دەنگی /ت/ سیمای گشتی هەڵ ناگرێت و لە هەر جێیەکی تردا، بێجگە لە مۆرفیمی ئێستایی، ڕەچەڵەکی بە سووك و ئاسانی دەناسرێتەوە.

نازناوی (خپ) بەخشراوە بە دەنگی /ت/، چونکە بە تەواوی خپ و بەبێ (زەبری بزوێن) گۆ ناکرێت. دەنگی (خپ) لە زمانی تردا هەیە و تشتێکی ئاساییە کە لە زمانەکەی ئێمەیشدا هەبێت، وەك هەیە.

**٥/٢: بەرەنجامی پێشکەوتوو:**

- لە سەرجەمی ئێشەکانی ئێمەدا، تیۆری (زەبری بزوێن) پیادەکراوە، بەلآم لە ئەم تیۆریەدا پێناسەی (ناوگر) دەگۆڕێت و جودا دەبێتەوە، چی لە هی دەنگسازانی کورد، چی لە هی دەنگسازانی دەوروبەر، چی لە هی دەنگسازانی رۆژئاوا. چونکە پێناسەی ناوگری نێوان دوو (نەبزوێن)، یان ناوگری نێوان دوو (بزوێن)، زۆر درشتە و پێویستە ورد بکرێتەوە بۆ رەگەزە بنەڕەتیەکانی (بڕگە)، چونکە هیچ دەنگێکی گۆکراو لە زارەوە بەرهەم ناهێنرێت و رووی گۆکردنی نیە، ئەگەر لە چێوەی نەگۆڕی بڕگەدا لە قالب نەدرێت.
- ناوگری نێوان (دوو نەبزوێن)، وەك (تـﹻـن)، بریتیە لە بزوێنی (بزرۆکە)ی هەردەم (ئامادە و لە سەرپێ). ئەو ناوگرە، لە بەر ئەوەی بزوێنە، چێوەی بڕگەی خۆی هەیە و دەنگی نەبزوێنی یەکەم /ت/ی لە خانەی نەبزوێن (خ ن)دا ئاکنجی کردوە و بوە بە (پاڵنەر) بۆی. دەنگی نەبزوێنی دوەم /ن/، لە گۆکراوی (تـﹻـن)دا، لە گیرفانی دامێن (گ د)دا ئاکنجی بوە، بەلآم وەك نەبزوێنێکی پەراوێزی. بە کۆی هەر سێ دەنگەکە بڕگەیەکی پڕ پەیدا بوە لە چەشنی (تـﹻـن|CVc)، کە رووی گۆکردنی پەیداکردوە. کەواتە، پرسی ناوگری نێوان (دوو نەبزوێن) بریتیە لە پەیدابوونی (بزوێن)ێکی پاڵنەر، بۆ پاڵنانی نەبزوێنی یەکەم. لە ئەنجامی ئەم پرسەدا، نەبزوێنی دوەم بۆی هەیە بە شێوەیەکی کاتی بچێتە نێو گیرفانی دامێنی بڕگەکە.
- ناوگری نێوان (دوو بزوێن) بریتیە لە هەر (نەبزوێن)ێك. ئەو ناوگرە لکاوە بە سەری بزوێنی دوەمەوە و وزەکەی دامراندوە. کەواتە، هیچ پەیوەندیەکی نیە بە بزوێنی یەکەمەوە، چونکە ئەویش بزوێنە و تاپۆی بڕگەی خۆی هەیە. لە گۆکراوێکدا وەك: (ئەو[redacted])، ناوگری /ي/ لە خانەی نەبزوێن (خ ن)دا ئاکنجی بوە و کلکی لکاوە بە سەری بزوێنی دوەمەوە. بە کۆی هەردوو دەنگەکە بڕگەیەکی سووك پەیدا بوە لە چەشنی (یــــە|CVo). کەواتە، پرسی ناوگری نێوان (دوو بزوێن) بریتیە لە

**پەیدابوونی (نەبزوێن)ێکی ڕێخۆشکەر بۆ بزوێنی دوەم، بۆ ئەوەی نەخشێت لە کلکی بزوێنی یەکەم و رووی گۆکردنی هەبێت لە چێوەی بڕگەی خۆیدا.**

**لە کۆتاییدا بە هیواین ئەم بابەتە سەرنجی ڕێزماننووسان و توێژەران رابکێشێت، چونکە ڕێزمانی ئەم مۆرفیمە گرنگە کەڵکلێکی زۆر زۆر ورد و کاریگەر دەبەخشێت بە ڕێزمانی کوردی. لە ئەم روانگەیەوە، دەنگی /ت/ مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەناسێتەوە و ئاشکرای دەکات. بە تایبەتی لە ئەو جێگایانەدا کە روخسارەکەی پواوە، بەڵام ئەرکەکەی هەر ماوە. بێگومان، مۆرفیمی ئێستاییش نەخشەرێگای ڕێزمانی کاری (بوون) یەکلایی دەکاتەوە و ئەم کارەش دەستپێك دەستنیشان دەکات لە نەخشە گەورەکەی (رستەسازی)دا.**

سەرچاوە:

١. ئەوەی لەم نووسینەدا باسکراوە و لەزۆر جێی تردا، لە نووسینەکانی تردا باسمان کردوە، لە ئێرەدا نەختێك بە شێوەیەکی فراوانتر و قووڵتر لە بابەتەکە دواوین.

٢. برای بەڕێز د. رەفیق شوانی لە کتێبەکەیدا (چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٠) هەندێك پەراوێزی لەسەر ئیشەکانی ئێمە نووسیوە، کە هیچ ناگۆڕن لە ئیشەکانی ئێمە و هیچ کەڵکیك نابەخشن بە بابەتەکە.

٣. د. وریا عومەر ئەمین، لێکۆڵینەوەیەکی مۆرفۆفۆنیمی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژمارە (٢٩ ـ ٣٠)، بەغدا ٢٠٠٢.

# بابەتی سێیەم

## مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لەسێتی ڕێزمانیدا[3]

### ١/٣: دەستپێك:

ئێمە ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بـە سـەرەتا و بـە بنچینە دەزانـین. هـەر لەبەر ئەو هۆیە، بایەخێکی یەکجار زۆرمان داوە بە ئەو لایەنە و لە چەندین نووسـیندا لێی دواوین. تەنانـەت دوو کتێبمـان دەربـارەی ئـەو مۆرفیمـە بڵاوکردوەتـەوە، بـە نـاوی (ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی/٢٠٠٦) و (پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی/٢٠١٥). هەوەها، سێ کتێبمان لە سەر ڕێزمانی بوون و هەبوون بڵاوکردوەتەوە (١٩٩٧/٢٠١٤/٢٠١٥)[4]، بەڵام هێشتا هەر پاراو نەبووین و هێشتا هەر پێمان ماوە. ئێمە لە ئـەو بـاوەڕەداین، کـە شارەزابوون لە ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی بریتیە لـە شـارەزابوون لـە (نیـوەی ڕاسـت)ی ڕێزمانی کوردی. سەبارەت بەناونیشانی باسەکە، ئێمە (سێتی ڕێزمانی) بە کەرەستەیەکی کاریگەر و بەکار دەزانین بـۆ سـاغکردنەوەی بابەتـە ڕێزمانیـە کێشەدارەکان. لـە زمـانی کوردیـدا، زاراوەی (سـێت) بـە واتـای (دەسـتە، تـاقم، پێـڕ) بـرەوی هەیـە. بـۆ نموونـە، پارچەکانی هەر سێتێك بە خزمایەتیەك دەبەسترێن بەیەکەوە و کۆی ئـەو پەیوەندیـە هاوبەشە ناوی ئەو سێتە پێـك دەهێنێـت. لـە ئـەم نووسـینەدا، مـۆرفیمی ئێسـتایی (ـە) دەخەینە نێو سێتەکەی خۆی و ئەمجا لە ڕووبەری زمانەکەدا، بۆ پارچەکانی ئەو سێتە دەگەڕێین و کۆیان دەکەینەوە. بە هیواین، کەرەسـتەی (سـێتی ڕێزمـانی) بـە شـێوەیەکی

---

[3] گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٣٢/ ٢٠٠٦). لا (٦٢ ـ ٦٩).

[4] بڕوانە بۆ لیستی سەرچاوەکان.

سفتتر و خنجتر بابەتەکە بگەیەنێت بە خوێنەر و بە توێژەری نازیز. ئەمە و بە کۆی گشتی، مژاری جێناوی لکاو، لە چەشنی (م، یت، ــ، ین، ن، ن)، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەشارێتەوە بە داپۆشینی فۆرمە دەنگیەکەی و ناهێڵێت دەربکەوێت، بەلاّم ئێمە دەمانەوێت ئەو دوو مۆرفیمە (داپۆشەر و داپۆشراو)ە لە یەکتری جودا بکەینەوە.

۲/۳: مۆرفیمی ئێستایی و سێتی ڕێزمانی:

لە سادەترین و لە بنجیترین بەکارهێناندا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە سێتی شەش ڕێزەدا دەگوزەرێت، وەك:

من (م) : ئێمە (ین)

تۆ (یت) : ئێوە (ن)

ئەو (ە) : ئەوان (ن)

لە ئەم نموونانەدا، گشت زمانزانێك، یان ڕێزمانزانێك، تێ دەگات کە ئەو ڕێزانە بریتین لە (سێت) و ژمارەیان شەش ڕێزەیە. لە هەمان کاتدا، ناتوانین ڕێزەیەکی دیکە بدۆزینەوە، تا ژمارەیان بکەین بە هەفت ڕێزە، یان ڕێزەیەکیان پووچەڵ بکەینەوە، تا ژمارەیان ببێت بە پێنج ڕێزە. کەواتە، ژمارەی پارچەکانی ئەو سێتە بریتیە لە (شەش پارچە) بەبێ کەم و بەبێ زیاد. ئەوەیش لە یادنەکەین، کە هەر شەش ڕێزەکە یەك واتا دەبەخشن، بەلاّم بۆ شەش کەسە ڕێزمانیەکە. ئەم شەش ڕێزەیە ئەگەر بەراورد بکرێن بە زمانێکی تر، ئەوا بەرانبەر بە شەش ڕێژەی کارێك دەوەستن. لە زمانی ئینگلیزیدا، بەرانبەر بەکاری (verb to be) دەوەستن و لە زمانی فەرەنسیدا، بەرانبەر بەکاری (etre) دەوەستن. کەواتە، دەتوانین ئەو سێتە ناوبنێین (بوونی ئێستایی)، یان (سێتی مۆرفیمی ئێستایی)، کە بریتیە لە:

سێت = (م، یت، ـە، ین، ن، ن)

لە هەر جێیەکدا کە ئەو سێتە دروست بوو، ئەوا تێ دەگەین کە ڕێزمانی (بوونی ئێستایی) لە ئارادایە. هەر بۆ پرۆڤە، دەتوانین لە گەڵ ئەو سێتەدا ئاوەڵناوێك بکەین بە (پاڵپشت)، وەك:

من جوان (م) : ئێمە جوان (ین)

تۆ جوان (یت) : ئێوە جوان (ن)

ئەو جوان (ـە) : ئەوان جوان (ن)

بە سەرنجێکی هورد و ژیرانە، دەردەکەوێت کە سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ن، ن) بە جوانی و بە هوردی چەسپاوەتەوە، بەلام بۆ بەکارهێنانێکی تر. بە هەمان شێوە، دەتوانین ئەو سێتە لە جێیەکدا بدۆزینەوە کە ئامرازی پەیوەندی لەگەڵدا بێت، وەك:

من بۆ تۆ (م)، تۆ بۆ من (یت)، ئەو بۆ من (ـە)

ئێمە بۆ تۆ (ین)، ئێوە بۆ ئەوان (ن)، ئەوان بۆ ئێوە (ن)[5]

بێگومان، ئەگەر بە وردی سەیری بارگەی نێو کەوانەکان بکەین، دەبینین کە سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) دەرکەوتوە. کەواتە، لە ئێرەیشدا ڕێزمانی (بوونی ئێستایی) لە ئارادایە، بەلام لە بەکارهێنانێکی تردا.

### ٣/٣: لە گەڵ کاری هەبووندا:

ئێمە لە گشت جێیەکدا، ئەوە دووپات دەکەینەوە کە کاری (هەبوون) بریتیە لە دارشتەیەکی کاری (بوونی ئێستایی)، بەلام لە گەڵ پێشگری (هە)دایە. لە ئەم ڕووەوە، دەتوانین بۆ سێتە ڕێزمانیەکەی مۆرفیمی ئێستایی بگەڕێین، تا ناسنامەی ئەو کارە دیاری بکەین، وەك:

---

[5] وەك حەشارگەیەکی ڕیزمانی کوردی. ئەو جێناوە جودایانەی نێو ئەو ڕێژانە. ئەوە پەسەند ناکەن کە بکرێن بە جێناوی لکاو.

من هه (م)،   تۆ هه (یت)،   ئەو هه (ـە)

ئێمە هه (ین)،   ئێوه هه (ن)، ئەوان هه (ن)

به سەرنجێکی زرنگ، دەردەکەوێت کە لە ئێرەیشدا سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) دەرکەوتومتەوە. ئەمەیش بریتیە لە کاریگەرترین بەڵگە، بۆ سەلماندنی رەگێشە و رەچەڵەکی کاری (هەبوون) لە ڕێزمانی (بوونی ئێستایی)دا.

## ٤/٣: لەگەڵ کاری (بریتی لە...):

لەریزە نموونەیەکدا، وەك:

من بریتیـ (م)   لە پشتی ئێوه

تۆ بریتیـ (یت)  لە پشتی ئێمە

ئەو بریتیـ (ـە)  لە پشتی ئێمە

ئێمە بریتیـ (ین) لە پشتی ئێوه

ئێوه بریتیـ (ن)  لە پشتی ئێمە

ئەوان بریتیـ (ن) لە پشتی ئێمە،

دەبینین کە سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە ئێرەیشدا بەتەواوی بەرجەستەیە. کەواتە، دەستەواژەی (بریتی لە...) لەپەرێزی ڕێزمانی (بوونی ئێستایی)دایە.

## ٥/٣: لە رابردووی تەواودا:

لەرابردووی تەواودا، سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بە جوانی دەردەکەوێت، وەك:

من رۆیشتوو (م)،   تۆ رۆیشتوو (یت)،   ئەو رۆیشتوو (ە)

ئێمە رۆیشتوو (ین)، ئێوه رۆیشتوو (ن)، ئەوان رۆیشتوو (ن)

کەواتە، ئەم ماستەیش موویەکی تێدایە. ئەگەرنا، بۆچی هەمان سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لەرابردوودا دەرکەوتوە؟ یان، بۆچی لە گەڵ کارێکی تردا دەرکەوتوە لەچەشنی (ڕۆیشتن). لەجۆرە هەڵوێستی ئاوهادا، چارمان نامێنێت و دەبێت تێ بگەین کە (رابردووی تەواو) بە ڕێژەی کاری (بوونی ئێستایی) ڕۆدەنرێت. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە، دەبینین کە ئەو دیاردەیە گشتیە و گشت کاری زمانەکە دەگرێتەوە، تەنانەت ڕێژەی (بکەر نادیار)یش دەگرێتەوە، وەك:

من نووسراو (م)، تۆ نووسراو (یت)، ئەو نووسراو (ە)

ئێمە نووسراو (ین). ئێوە نووسراو (ن). ئەوان نووسراو (ن)

کەواتە، سێتی ڕێزمانی بریتیە لە کەرەستەیەکی بەکار و کاریگەر بۆ ئەوەی حەشارگەکانی ڕێزمانی کوردی بدۆزینەوە. لە ڕاستیدا، گشت ڕێژەکانی رابردووی تەواو، بۆ گشت کارەکانی زمانی کوردی بەرێژەی کاری (بوونی ئێستایی)، ڕۆدەنرێت. بە واتایەکی تر، سەرپاکی ڕێژە تێنەپەڕەکانی دەمکاتی (رابردووی تەواو) بە (ڕێژەی ڕانەبردوو)ی کاری (بوونی ئێستایی) چێ دەکرێت. بێگومان، ئەم ڕێسایە سەرپاکی (ڕێژەی بکەر نادیار) دەگرێتەوە، چونکە تێنەپەڕن.

٦/٣: لە ڕابردووی تەواوی تێپەڕدا:

ئەوەی لە کۆپلەی پێشوودا باسکرا هەر ڕێژەی (تێنەپەڕ)ی دەگرتەوە و لە ئەو هەڵ و مەرجەدا، کە میچەکانی سێتە جێناوی (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان) دەبوون بە (بکەر) لە ڕستەکاندا. سەبارەت بە ڕێژەی (تێپەڕ)، گرنگ ئەوەیە کە هەمان سێتە جێناوەکەی مۆرفیمی ئێستایی تێدا بدۆزینەوە، بۆ ئەم مەبەستە، ڕوو دەکەین لە کارێکی تێپەڕی وەك (نووسین)، لە دەمکاتی ڕانەبردووی تەواودا، وەك:

| بەرکار بە (جێناوی جودا) | بەرکار بە (جێناوی لکاو) |
|---|---|
| ئەوان (من) یان نووسیوە | ئەوان نووسیویان (م) |
| ئەوان (تۆ) یان نووسیوە | ئەوان نووسیویان (یت) |
| ئەوان (ئەو) یان نووسیوە | ئەوان نووسیویان (ـە) |
| ئەوان (ئێمە) یان نووسیوە | ئەوان نووسیویان (ین) |
| ئەوان (ئێوە) یان نووسیوە | ئەوان نووسیویان (ن) |
| ئەوان (ئەمان) یان نووسیوە | ئەوان نووسیویان (ن) |

لە نموونەکانی دەستە ڕاستدا، ئەگەر جێناوە جوداکانی نێو کەوانەکان، کە لە ڕۆڵی (بەرکار)دان، بکەین بە (جێناوی لکاو)، ئەوا سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) دەرکەوێت لە نموونەکانی دەستەچەپدا. لە ئەم ئاستەدا، ئەگەر بڕوانین لە ئەو دوو سێتە ڕستەیە، چەند ڕاستییەك بەدی دەکەین، وەك:

یەکەم: ڕێژەکان تێپەڕن و لە دەمکاتی (ڕابردووی تەواو)دان.

دووەم: سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی بەبێ هیچ کەم و کورتیەك دەرکەوتوەتەوە.

سێیەم: لە ئەو ڕێژە تێپەڕانەدا، سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە ڕۆڵی (بەرکار)دایە.

کەواتە، لە ڕێژەی (تێنەپەڕ)دا، ئەو سێتە ڕێزمانیە لە ڕۆڵی (بکەر)دایە، کەچی لە ڕێژەی (تێپەڕ)دا لەرۆڵی (بەرکار)دایە. ئەم ڕاستییەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەرکی سێتە جێناوە لکاوەکە لە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی (تێنەپەڕ)دا هەر ئەرکی (ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردوو) بوە، بەڵام لە ڕابردووی تەواوی (تێپەڕ)دا، هەم ئەرکی (ڕۆنان) بوە و هەم ئەرکی (وەرچەرخانی ڕۆڵی جێناو) بوە. کەواتە، سێتە ڕێزمانیەکەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) وەك توانی دیاردە ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردوو بدۆزێتەوە، هەر ئاوهایش توانی

میکانیزمی (وەرچەرخانی ئەرکی جێناو)، لە (بکەر)ەوە بۆ (بەرکار)، بدۆزێتەوە. بە ئەم پێیە، ئەو کەسەی کە بیەوێت لە ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی تێ بگات، دەبێت لە (دیاردەی ڕۆنانی ڕێژەی رابردوو) و لە (دیاردەی وەرچەرخانی ئەرکی جێناو) تێ بگات، تا بتوانێت بە هەنگاوی دروست لە ڕێزمانی کوردیدا نەخشەی توێژینەوە بنەخشێنێت.

## ٧/٣: پوختەکاری و لێکدانەوە:

بۆ ئەوەی بتوانین جارێکی تر و بە شێوازێکی کاریگەرتر لە سێتە ڕێزمانیەکەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بدوێین، لە ئەم پوختەکاریەدا دەرگای گفتوگۆ و لێکدانەوە دەکەینەوە لە سەر نەخشەی دابەشبوونی ئەو سێتە جێناوە لە رووبەری زمانی کوردیدا، بە ئەم چەشنەی خوارەوە:

یەکەم: لەسەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، سێتێکی شەش کەسی ڕێزمانی دیاریکرا بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، وەك: (ەن یت، ـە، ین، ن، ن). کەواتە، ئەم سێتە هەر شەش ڕێژەکەی کاری (بوونی ئێستایی) دەنوێنن و ئەگەر لە هەر جێیەکی تردا دەرکەوتن، بە ئەو شەش روخسارەوە و بە ئەو سیمای سێتایەتیەوە، ئەوا کاری (بوونی ئێستایی) لە ئارادایە. یان لە هەر جێیەکدا کە لەنگی دەرکەوت، ئەوا کاری بوونی ئێستایی لە ئارادا نیە. بۆ نموونە، لە نێوان ئەم رستانەدا سێتێکی ڕێزمانی پەیدا دەبێت، وەك:

من کەوت (م) : ئێمە کەوت (ین)

تۆ کەوت (یت) : ئێوە کەوت (ن)

ئەو کەوت (ـ) : ئەوان کەوت (ن)

بە سەرنجێکی هورد دەردەکەوێت کە سێتەکە بریتیە لە (م، یت، ـــ، ین، ن، ن). واتە، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەرنەکەوتوە، کەواتە، ئەم سێتە هەرچەند پێنج لە پارچەکانی لە

سێتەكەی مۆرفیمی ئێستایی بن، بەڵام بریتیە لە سێتێكی تر، كە جیاوازە لە ئەو سێتەی كە لە ئەم نووسینەدا بوە بە سەردێری باسەكەمان.

دوەم: سێتە ڕێزمانیەكەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە چەند جێیەكدا دۆزرایەوە، بۆ نموونە، لە گەڵ (ئاوەڵناو) و لە گەڵ (ئامرازی پەیوەندی) و لە گەڵ دەستەواژەی (بریتی لە...). ئەمە گرنگ نیە، چونكە ڕێزمانەكەی ئاشكرایە، بەڵام بە (پەرپووتی) و بە (پەرتی) دەگوترێتەوە، یان بازی بە سەردا دەدرێت. لە گەڵ ئەوەیشدا، لە هەمان ڕووبەری ڕانەبردوودا، دەشێت لە چەند جێیەكی تردا بی دۆزینەوە، بەڵام هەر دەگەڕێنەوە بۆ ڕێزمانی بوونی ئێستایی. یان، ئەگەر ئاڵۆزییەك دەركەوت، ئەوا ئەو ئاڵۆزیە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سێتەكە، نەك خودی سێتەكە خۆی. بۆ نموونە، ئەگەر گوترا:

ئەو كچە چاوجوانە خوشكی شیرینە بچكۆلەی هاوڕێمانـ (ـە)

ئەوا، بكەری (ئەوە) درێژبوەتەوە، یان ئاوەڵناوی (خوشك) درێژكراوەتەوە و باركراوە و سێتەكەی مۆرفیمی ئێستایی هیچ پەیوەندییەكی نیە بە ئەو ئاڵۆزییەوە و هەر بریتیە لە (م، یت، ـە، ین، ن، ن) بۆ هەر شەش كەسە ڕێزمانیەكە.

سێیەم: پلەیەك لە ئەوە ئاڵۆزتر، بریتیە لە كاری (هەبوون) بە تێنەپەڕی، لە ڕاستیدا بەكارهێنانی سێتە ڕێزمانیەكەی مۆرفیمی ئێستایی لە ڕانەبردووی كاری (هەبوون)دا هیچ پاساوێك ناهێڵێت، بۆ ناسینەوەی ڕۆنانە ڕەسەنەكەی، وەك (هە + بوون). هەر بۆ نموونە، دەتوانین سێتەكە بەراورد بكەین لە نێوان (بوونی ئێستایی) و كاری (هەبوون)دا، وەك:

| هەبوون | بوون |
|---|---|
| من هە (م) | من (م) |
| تۆ هە (یت) | تۆ (یت) |
| ئەو هەیـ (ـە) | ئەو (ە) |
| ئێمە هە (ین) | ئێمە (ین) |
| ئێوە هە (ن) | ئێوە (ن) |
| ئەوان هە (ن) | ئەوان (ن) |

بە سەرنجێکی ساف و سفت، دەردەکەوێت کە سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) بە تەواوی، بە ڕادەی (سەت لە سەت)، لە هەردوو کارەکەدا هاوبەشە. هەر لەبەر ئەوە، دەشێت بڵێین: رەگێشە و رەچەڵەکی کاری (هەبوون) ئاشکرایە و لە پەرێزی (بوونی ئێستایی)دایە. کەواتە، هەنگاوی ژمارە (سفر)ی کاری (هەبوون) دەست پێ دەکات. بەواتایەکی تر، هەرچی لە سەر ڕێزمانی (هەبوون) گوتراوە، بەبێ (بوونی ئێستایی) بریتیە لە بابەتێکی کلۆر و بێ بناغەی زانستی.

چوارەم: لە ئاستێکی زۆر زۆر گرنگتردا، سێتە ڕێزمانیەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە رووبەری (رابردووی تەواو)دا دۆزرایەوە، بە دیاری کراوی لە رۆڵی (بکەر)ی ڕێژەی (تێنەپەڕ)دا، وەك:

| ڕابردووی تەواو (تێنەپەڕ) | بوون |
|---|---|
| من خەوتوو (م) | من (م) |
| تۆ خەوتوو (یت) | تۆ (یت) |
| ئەو خەوتوو (ە) | ئەو (ە) |
| ئێمە خەوتوو (ین) | ئێمە (ین) |
| ئێوە خەوتوو (ن) | ئێوە (ن) |
| ئەوان خەوتوو (ن) | ئەوان (ن) |

ئەمە و با سەیری ئەو دوو دەستە نموونەیە بکەین و بزانین کە سێتەکە بە (تەواوەتی) و بە (بەراورد) هاوبەشە و ئەو دیاردەیەیش هەر لە کاری (خەوتن)دا نیە، لە گشت کارێکی (تێنەپەڕ)دا هەیە. تەنانەت لە کاری (بکەر نادیار)یشدا هەیە. کەواتە، ئەگەر ئەو سێتە بە تەواوی بەبێ (کون و کەلێن) لە (ڕابردووی تەواو)دا دەربکەوێت بە گشتی، دەبێت بیروبۆچوونمان بگۆڕین بڵێین: (ڕێژەی کاری ڕابردووی تەواوی تێنەپەڕ) بە ڕێژەکانێ (بوونی ئێستایی) ڕۆدەنرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سێتە ڕێزمانیەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) میکانیزمێکی تازەی دۆزییەوە، بۆ ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردووی تەواو.

پێنجەم: لە پاش خاڵی پێشوو، خاڵێکی تر دەست پێ دەکات، چونکە سێتەکە جارێکی تر لە ڕابردووی تەواودا دەرکەوتوە، کەچی ئەمجارەیان لە ڕۆڵی (بەرکار)دا، نەك (بکەر)، بەڵام لە پەرێزی (ڕێژەی تێپەڕ)دا، وەك:

| بوون | ڕابردووی تەواو (تێپەڕ) |
|---|---|
| من (م) | تۆ گرتووت (م) |
| تۆ (یت) | من گرتوومـ (یت) |
| ئەو (ە) | تۆ گرتووتـ (ـە) |
| ئێمە (ین) | ئەوان گرتوویان (ین) |
| ئێوە (ن) | ئەوان گرتوویان (ن) |
| ئەوان (ن) | ئێمە گرتوومان (ن) |

لە بەراوردێکی هورد و سفتدا، دەردەکەوێت کە هەمان سێتەکەی مۆرفیمی ئێستایی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە پەرێزی ڕابردووی تەواوی تێپەڕدا دەرکەوتوە و لەرۆڵی (بەرکار)دایە. کەواتە، لە ڕێژەی تێپەڕدا ئەرکی ئەو سێتە ڕێزمانیە گۆڕاوە لە (بکەر)ەوە بۆ (بەرکار. بە ئەم پێیە، وەك چۆن میکانیزمی (ڕۆنانی ڕابردووی تەواو) دۆزرایەوە. هەر ئاوهایش میکانیزمی (وەرچەرخانی ئەرکی جێناو) دۆزرایەوە. واتە، سێتی ڕێزمانی ئەوەندە کاریگەرە، دەشێت هەندێك دیاردە بدۆزێتەوە، کە چاوی بیر ساڵەهای ساڵ گێلەی لێ کردبێت، هەرچەندە ئەو دیاردانە بریتی بن لە مۆرکە ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی.

## ٨/٣: بەرەنجامی پێشکەوتوو:

- لە هەر جێیەکدا کە سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) ڕیزی بەستبێت، وەك ئەو نموونانەی کە لە ئەم نووسینەدا باسکران، دەشێت نیشانەی نەرێ (نی) بکەین ئامێری (ناسەرەوە) بۆ بینینەوە و ناسینەوەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ڕیزەکەدا، وەك (من نیـم، تۆ نییت، ئەو نییە، ئیمە نیین، ئێوە نیـن، ئەوان نیـن)، لە جیاتی (منم، تۆیت، ئەوە، ئیمەین، ئێوەن، ئەوانن).

- ناوەڕۆکی خاڵی پێشەوە هەر لە دەمکاتی (ڕانەبردوو)دا دەچەسپێت و نیشانەی ([redacted]) دەردەکەوێت، چونکە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ئەرکی ڕەسەنی خۆیدایە. لە دەمکاتی (ڕانەبردوو)دا، دەرکەوتنی نیشانەی ([redacted]) ناچەسپێت، چونکە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، ئەگەر هەبێت لە ڕیزەکەدا، لە ئەرکی لاوەکی ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردووی تەواودایە، نەك ئەرکی ڕەسەنی خۆی.

سەرچاوە:

لە پێداچوونەوەدا، کەڵك وەرگیراوە لە هەندێك لە ئیشەکانی خۆمان، بە تایبەتی لە ناوەڕکی هەر پێنج کتێبی:

(١): میکانیزمە بنەرەتیەکانی ڕستەسازی: ڕێزمانی بوون و هەبوون/ هەولێر ١٩٩٧.

(٢): ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی/ هەولێر ٢٠٠٦.

(٣): ڕێزمانی بوون و هەبوون لە شرۆڤەکاری زانستیدا/ هەولێر ٢٠١٥

(٤): پانۆڕامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی/هەولێر ٢٠١٥.

(٥): گەشتێك بە نێو ڕێزمانی بوون و هەبووندا/ هەولێر ٢٠١٦.

# بابەتی چوارەم

## مۆرفیمی ئێستایی بە ئاوێتەیی[٦]

**١/٤: دەستپێك:**

لە دەیان نووسیندا، ئێمە لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دواوین و ڕێزمانەکەیمان لێکداوەتەوە، تەنانەت دوو کتێبمان لەسەری بڵاوکردوەتەوە بەناوی:

(١): مۆرفیمی ئێستایی (ـە)/ هەولێر، ٢٠٠٦.

(٢): پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)/ هەولێر، ٢٠١٥.

ئەمە و لەگەڵ ڕێزمانی (بوون و هەبوون)دا، لەچەندین جێدا ئەو بابەتە گرنگەمان خستوەتە بەر زوومی توێژینەوە. واتە، هەر لە سەرەتای ئیشەکانەوە. ئێمە مۆرفیمی ئێستاییمان بە (هەوێن)ی ڕستەسازی داناوە، لە بچووکترین ڕستەی زمانی کوردیدا، وەك:

منم: ئێمەین، تۆیت: ئێوەن، ئەو[redacted]: ئەوانن

بە بۆچوونی ئێمە، لە ئەو سێتە ڕستەیەدا مۆرفیمی ئێستایی هەیە و ڕۆڵی (جووتکەر) دەبینێت لە نێوان بکەری جودا (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان) و بکەری لکاو (م، یت، ە، ین، ن، ن)دا. لە گشت ئیشەکانی ئێمەدا، ئەو ڕاستیە سەلمێنراوە کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ڕیزەکەدا هەیە، بەڵام داپۆشراوە بە جێناوەکانی (م، یت، ـ، ین، ن، ن). ئەوەیش لە یاد نەکەین کە دەرکەوتنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە). لە ئاستی کەسی سێیەمی تاکدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە جێناوەکەی کەسی سێیەمی تاك (نادیار)ە. لە ئەو نووسینانەدا کە بڵاوکراونەتەوە، چەندین میکانیزم خراوەنەتە ڕوو بۆ دەربازکردن و ئاشکراکردنی مۆرفیمی ئێستایی لە داپۆشراوی. لە ئەم نووسینەدا، واز لە

---

٦ گۆڤاری (ئەوشەفەق). ژمارە (٦٢). هەولێر ٢٠٠٨.

باری داپۆشراوی دەهێنین ڕوو دەکەین لە باری (تێکتواوەیی)، یان باری ئاوێتەیی، لە ئەم جۆرە بارەدا مۆرفیمەکە ئاوێتە دەبێت و جودا دەبێتەوە لە جێناوە لکاوەکان.

**٢/٤: لە سێتە جێناوی (م، یت، ە، ین، ن، ن)دا:**

- هەر شەش ئەندامی سێتەجێناوەکە بارگاوین بە مۆرفیمی ئێستاییەوە، چونکە ئەو مۆرفیمە لە سەر کورسی (کەسی سێیەمی تاك)دا دانیشتوە و دەرکەوتوە، وەك (م، یت، ە، ین، ن، ن). بە واتایەکی دی، ئەگەر هەر یەکێك لە ئەندامەکانی سێتەکە وەربگرین، ئەوا بە ڕواڵەت جێناوێکی ڕووت دەبینین، بەڵام لە ڕەسەندا ئەو جێناوە بارگاویە بە ڕێژەی کاری بوونەوە. بۆ نموونە جێناوی لکاوی (ین) بەرانبەر بە (we are) دەوەستێت لە زمانی ئینگلیزیدا. لەم ئەم زمانەدا ڕەگەزی کاری بوون (to be) و جێناوی کەسی یەکەمی کۆ (we) بە جودایی دەرکەوتوون، کەچی لە زمانەکەی ئێمەدا، هەر جێناوەکە (ین) دیارە، بەڵام بارگاویە بە واتای ڕێژەی کاری (بوون)ەوە. ئەم بەراوردکارییە ڕەنگە بە جوانی ئەنجام نەدرابێت، چونکە هەردوو زمانەکە جیاوازن لە یەکتری، بەڵام ئەو نموونەیە مەبەستی لێکۆڵینەوەکە دەپێکێت. لە لایەکی ترەوە، لە هەر جێیەکدا کە میچەکانی سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) ڕیز بوون. ئەوا مۆرفیمەکە لە ڕیزەکەدا بەرجەستەیە، بەڵام بە داپۆشراوی، وەك:

تۆ نە/ت/ ناسیو(م)، من نە(م) ناسیو(یت)، تۆ نە/ت/ ناسیو(ە)
تۆ نە/ت/ ناسیو(ین)، من نە(م) ناسیو(ن)، تۆ نە/ت/ ناسیو(ن)

لە ئەو سێتە نموونەیەدا سێتە جێناوەکە دەرکەوتوە و لە ڕۆڵی (بەرکار)دایە، لە گشت ئیشەکانی ئێمەدا، چەندین میکانیزم بەکارهێنراوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئەو سێتە جێناوە بارگاویە بە مۆرفیمی ئێستاییەوە، وەك:

### ٣/٤: بڕکردنی مۆرفیمی ئێستایی:

زاراوەی (بڕکردن) واتای جوداکردنەوە و هاوێرکردن دەبەخشێت. بە واتایەکی تر دەمانەوێت مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بڕ بکەین لە ئەو جێناوە لکاوەی کە دای پۆشیوە. کەواتە دەبێت میکانیزمێك بدۆزینەوە، کە بتوانیت کۆلکە دوو ڕەگەزەکان لەت بکات و ئەو لەتەی دەربخات کە لە بەر چاو نیە، بەلام ڕامانێکی واتایی هەیە. ئەوەش لە یاد نەکەین کە ئەو میکانیزمەی بەکار دەهێنرێت دەبێت لە خودی ڕێزمانی کوردیەوە بێت. لە ئەو نووسینانەدا کە بلاومان کردوونەتەوە دەیان جار ئەو میکانیزمانە بەکارهێنراون و باسکراون، تەنانەت لە بابەتەکانی ئەم کتێبەی بەردەستدا، بەلام مەبەستی ئەمڕۆمان بریتیە لە جوداکردنەوەی مۆرفیمەکە لە جێناوە لکاوەکە. لە ئەو سێتە ڕستەیەدا کە لە پێشەوە باسکرا، سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) بەرجەستەیە و لە خۆشبەختیدا ڕێزمانی کوردی ڕێ دەدات کە جێناوە لکاوەکان جودا بکەینەوە و مۆرفیمی ئێستایی بە بڕکراوی ببینین، لە ئەم ڕوانگەیەوە، ئەم میکانیزمە کاتێك دەچەسپێت کە:

یەکەم: ڕستەکە لە دەمکاتی ڕابردووی تەواودا بێت.

دوەم: کارەکە (تێپەڕ) بێت و سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە ڕۆڵی (بەرکار)دا.

لەم ئەم هەلومەرجەدا، دەتوانین (بەرکار)ی دەربڕاو بە (جێناوی لکاو) بگۆڕین بە بەرکاری دەبڕاو بە (جێناوی جودا) وەك:

| | |
|---|---|
| تۆ نە/ت/ ناسیو(م) : | تۆ (من)ت نەناسیو(Ø) |
| من نە(م) ناسیو(یت): | من (تۆ)م نەناسیو(Ø) |
| تۆ نە/ت/ ناسیو(Ø): | تۆ (ئەو)ت نەناسیو(Ø) |
| تۆ نە/ت/ ناسیو(ین): | تۆ (ئێمە)ت نەناسیوە(Ø) |
| من نە(م) ناسیو(ن): | من (ئێوە)م نەناسیوە(Ø) |
| تۆ نە/ت/ ناسیو(ن): | تۆ (ئەوان)ت نەناسیوە(Ø) |

بە سەرنجێکی هورد لە ئەم نموونانە، چەند ڕاستییەك دەردەكەون، وەك:

یەکەم: ئێمە جێناوی لکاوی (بەرکار)مان گۆڕی بە جێناوی (جودا) کەچی (سەرباقی) مایەوە. بۆ نموونە، جێناوی (م) کرا بە جێناوی (من)، کەچی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بوو بە (سەرباقی). وەك:

جێناوی (م) ← جێناوی (من) + مۆرفیمی ئێستایی (ـە)

دووەم: لە کەسی سێیەمی تاکدا، جێناوە لکاوەکە نادیارە. هەر لە بەر ئەوە، مۆرفیمەکە (ـە) دانەپۆشراوە و لە پاش دانانی جێناوی جودا (ئەو) هەر دیارە.

سێیەم: لە ئەم میکانیزمەدا جێناوە داپۆشەرەکە لادەچێت، بەڵام مۆرفیمە داپۆشراوەکە لا ناچێت، چونکە ڕۆڵی ڕۆنانی هەیە لە ڕێژەی (ڕابردووی تەواو)دا.

چوارەم: بە ڕاستی و بە دروستی توانیمان بە ڕێزمانی کوردی بی سەلمێنین کە ئەو جێناوە لکاوانە بارگاوین بە مۆرفیمی ئێستاییەوە.

**٤/٤: مۆرفیمی ئێستایی بە تەواوەیی:**

لە هەندێك نموونەدا مۆرفیمی ئێستایی دەتوێتەوە و ئاوێتە دەبێت. واتە داناپۆشرێت بە جێناوی لکاو ، تا بتوانین ئاشکرای بکەین بە میکانیزمێك، کەچی دەتوێتەوە و دەبێت بە ئاوێتەیەك لە چەشنی ئاوێتەی کیمیاوی، کە ناشێت پێکهاتەکانی لە یەکتری پڕ بکەین، بۆ نموونە دەگوترێت:

من هە (م) : من کوا (م)؟

تۆ هە (یت) : تۆ کوا (یت)؟

ئەو هە (ـە) : ئەو کوا (-)؟

ئێمە هە (ین) : ئێمە کوا (ین)؟

ئێوە هە (ن) : ئێوە کوا (ن)؟

ئەوان هە (ن) : ئەوان کوا (ن)؟

له ئاستی ئەم دوو دەستە نموونەیەدا چەند راستیەك هەن، وەك:

یەکەم: له نموونەکانی دەستەراستدا، سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن) هەیە و ئاشکرایە و واتای کاری (بوون) زاڵە بە سەر رستەکاندا.

دوەم: له نموونەکانی دەستەچەپدا سێتە جێناوەکە گۆڕاوە بۆ (م، یت، -، ین، ن، ن)، بەڵام له ئێرەیشدا واتای کاری (بوون) زاڵە بە سەر رستەکاندا.

سێیەم: له بەر رووناکی ئەوەی گوترا، لە هەردوو سێتە رستەکەدا، هەمان رۆنانی رستەسازیانە و هەمان سێتە جێناو هەیە. لە سێتەکەی دەستەراستدا، جێناوەکان مۆرفیمەکەیان داپۆشیوە و لە جێناوی نادیاری کەسی سێیەمی تاکدا دەکەوتوە. لە نموونەکانی دەستەچەپدا، جێناوەکان رووتن و مۆرفیمی ئێستایی (ـە) تواوەتەوە لە ئامرازی (کوا)دا. تەنانەت، مۆرفیمەکە بە (رامان) هەیە، بەڵام لە کەسی سێیەمی تاکیشدا دەرنەکەتوە.

چوارەم: بە پێی ناوەرۆکی خاڵی پێشوو، مۆرفیمەکە بڕ بوە و جودا بوەتەوە لە جێناوەکان (م، یت، ـە، ین، ن، ن) چوەتە سەر ئامرازی پرسیار (کوا)، بۆ ئەوەی کۆڵکەیەکی تێکتواوەی (فرە رەگەز) دروست بکات.

پێنجەم: بە ئەم پێیە، ئامرازی (کوا؟) چەند جێماکێکی تێدا هەیە، وەك:

- ماکی ئامرازی پەیوەندی (لە...)
- ماکی ئامرازی پرسیار (کوێ)، وەك (لە کوێ؟)
- ماکی کاری (بوون) بە دیوی (ئەرێ)دا
- ماکی دەمکاتی (رانەبردوو)
- ماکی جێناوی کەسی سێیەمی تاکی نادیار

شەشەم: چەند بەڵگەیەك هەن بۆ ئەوەی باری ئاوێتەبوونی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) بسەلمێنین. واتە، مۆرفیمی ئێستایی لە ئاستی هەر شەش کەسەکەدا جودا بوەتەوە و ناشێت جارێکی تر لە ورگی ئامرازی (کوا؟) دەری بکەینەوە. ئەو بەڵگانەیش ئەمانەن:

بەڵگەی یەکەم: هەر شەش ڕێژەکەی ئامرازی (کوا؟) باری (نەرێ) پەسند ناکەن، ناگوترێت(*):

من کوام؟ : من کوا (نی)م؟ (*)

تۆ کوایت؟ : تۆ کوا (نی)یت؟ (*)

ئەو کوا(-)؟ : ئەو کوا (نی)...؟ (*)

ئێمە کوا(ین)؟ : ئێمە کوا (نی)ین؟ (*)

ئێوە کوا(ن)؟ : ئێوە کوا (نی)ن؟ (*)

ئەوان کوا(ن)؟ : ئەوان کوا (نی)ن؟ (*)

بەڵگەی دووەم: لە بەرئەوەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) تواوەتەوە و دەرناچێت لە ورگی ئامرازی (کوا؟)، ناتوانین ڕێژەی ڕابردوو چێ بکەین، وەك(*):

من کوام؟ : من کوا (بوو)م؟ (*)

تۆ کوایت؟ : تۆ کوا (بوو)یت؟ (*)

ئەو کوا؟ : ئەو کوا (بوو)...؟ (*)

ئێمە کواین؟ : ئێمە کوا (بوو)ین؟ (*)

ئێوە کوان؟ : ئێوە کوا (بوو)ن؟ (*)

ئەوان کوان؟ : ئەوان کوا (بوو)ن؟ (*)

ئەم جۆرە ڕێژەیەی کە، نە باری (نەرێ) و نە ڕێژەی (ڕابردوو) پەسەند دەکەن، خۆ لە خۆدا بریتین لە دوو (حەشارگە)ی ڕێزمانی کوردی، چونکە گشت ڕێژەیەك ئەو دوو بارە پەسەند دەکات.

**٥/٤: نیشانەی نەرێ (نی):**

له ریزه نموونەیەکدا، وەك:

منِ ــ (م) : من (نی) (م)

تۆ ــ (یت) : تۆ (نی) (یت)

ئەو ــ (ە) : ئەو (نی)یـ (ـە)

ئێمه ــ (ین) : ئێمه (نی) (ین)

ئێوه ــ (ن) : ئێوه (نی) (ن)

ئەوان ــ (ن) : ئەوان (نی) (ن)،

نیشانەی نەرێ (نی) دەرکەوتوه، بەلاّم مۆرفیمەکه هەر ماوەتەوه لـه ریزەکـەدا. کەواتـه نیشانەی (نی) بریتی نیه له پێکهاتەیەکی دوو رەگەز، بەلّکو بریتیه له پێکهاتەیەکی یەك رەگەز بۆ به (نەرێکردنی) مۆرفیمی ئێستایی (ـه). ئەمه و دەرکەوتنی نیشانەی (نی) له ئاستی هەر شەش کەسەکەدا بریتیـه لـه بەلّگەیـەکی بـەهێز بـۆ هـەبوونی رێـژەی کـاری (بوون) له ریزەکەدا، بەلاّم به نادیاری. بێگومان هەتا ئەمڕۆ (٢٠٠٨/١٠/٩) وا ماندەزانی که نیشانەی (نی) دووتوخمه و له ئەمڕۆوه دەتـوانین بلّێین: نیشانەی (نـی) روخسـارێکی نەخشکراوی هەیه له ئاستی مۆرفیمی ئێستایی (ـه)، که بریتیـه لـه رێـژەی کـاری بـوونی ئێستایی. بۆ نموونه، له رستەی سێیەمدا مۆرفیمی (ـه) دیـارەو ئاشـکرایه، بـەلاّم لـه (٥) نموونەکەی تردا دیار نیه به روخسار. له هەلومەرجی ئاوها مۆرفیمی ئێستایی، چی بـه (دیاری) و چی به (نادیاری) تەشەنەی خۆی دەکات و داوای نیشانەی نەرێ (نی) دەکات. له راستیدا دەرکەوتنەوەی مۆرفیمی ئێسـتایی (ـه) لـه رسـتەی سـێیەمدا و بـه تەریبـی لەگەلّ نیشانەی نەرێ (نی)، وا دەکات که نیشانەی (نی) به دوو رەگەز نه ناسین، له ئەم روەوه، دەتوانین بلّێین: ئەم نیشانەیه (نی) تایبەته به توخمی کاری بوونی ئێستایی (ـه) و تەنها له دۆخی مۆرفیمی ئێستاییدا دەردەکەوێت، وەك:

| باری نەرێ (نی + ـە) | باری ئەرێ (ـە) |
| --- | --- |
| شیلان جوان (نیـ + ـە) | شیلان جوان (ـە) |
| ئەمە ئەو (نیـ + ـە) | ئەمە ئەو(ە) |

کەواتە، هەبوونی نیشانەی نەرێ (نی)، لە تای تەرازووی ڕێزمانی کوردیدا، ئەوە دەگەیەنێت کە لە تایەکەی بەرانبەردا، چی بەدیاری و چی بە نادیاری، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) هەیە.

٦/٤: پوختەکاری:

لە ڕووبەری نووسینەکانی ئێمەدا، لە چەندین لاوە زوومی لێکۆڵینەوە ئاراستەی مۆرفیمی ئێستایی کراوە و چەندین توێژینەوەی لەسەر بڵاوکراوەتەوە. لە ئەم نووسینەدا جارێکی تر ڕوو دەکەینەوە لە ئەم ڕەگەزە ڕێزمانییە گرنگە و لە گۆشەنیگای (باری ناوێتەیی)یەوە سەیری دەکەین، وەك:

مۆرفیمی ئێستایی (ـە) هەر لە ڕەگیشەوە بوە بە (بارگە)یەك بۆ سێتە جێناوی (م، یت، ـە، ین، ن، ن). واتە، لە ئەو سێتە جێناوەدا کە مۆرفیمی ئێستایی لە جێی کەسی سێیەمی تاك دەرکەوتوە، هەر پێنج جێناوەکەی تر بارگاویین بە مۆرفیمی ئێستاییەوە و لە ژێر خۆیاندا دایان پۆشیوە.

ئەو سێتە جێناوە (م، یت، ـە، ین، ن، ن) لە دەمکاتی ڕانەبردوودا بریتین لە سێتەڕیزەی کاری (بوونی ئێستایی)، بەڵام لە ڕابردوودا بریتین لە (ڕیزەی ڕۆنەر) بۆ دەمکاتی ڕابردووی تەواو.

ئەو سێتە جێناوە بارگاویە (م، یت، ـە، ین، ن، ن)، کە بریتییە لە ڕیزەکانی کاری (بوونی ئێستایی)، ئەرکی (بکەر) دەگێڕێت لە ڕیزەی (تێنەپەڕ)دا و ئەرکی (بەرکار) دەگێڕێت لە ڕیزەی (تێپەڕ)دا.

هەر ڕێژەیەك لە (نەرێ)دا داوای نیشانی (نی) بکات و هەرچەندە پێچپێچاوی بێت، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە ریزەکەدا.

لە ئامرازی (کوا؟)دا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) جودا بومەتەوە لە جێناوە لکاوەکان و بوە بـە ئاوێتەیـەکی جـێگیر لـە جەسـتەی کەرەسـتەی (کـوا؟)دا. هـەر لەبـەر ئـەو هۆیـە، نەدەتوانرێت ڕێژەی (نەرێ) چێ بکرێت و نە دەتوانرێت دەمکاتی ڕابردوو چێ بکرێت بۆ ئامرازی پرسیار (کوا؟). لە گشت دۆخەکانی تردا، دەتوانرا مۆرفیمی ئێستایی دەرباز بکرێت لە (داپۆشین)، کەچی لە ئامرازی (کوا؟)دا ئاوێتەکە هێندە پتەوە، کە ناتوانرێت پێکهاتەکان لە یەکتری جودا بکرێنەوە. بە هەمان شێوە، لە وەڵامی ئامرازی (کوا؟)دا، وەك (ئەوەتا) و لە بەرپەرچی کەرەستەی (کامەتا؟)دا، مۆرفیمی ئێستایی بـوە بـە ئاوێتـە و جودا ناکرێتەوە.

بە پێی بۆچوونی پێشووی ئێمە، لە نیشانەی (نەرێ)دا مۆرفیمی ئێستایی (ـە) کارلێکی کردوە لە نیشانەی (نە) و گۆڕیویەتی بە (نی)، بەڵام لە ئەم دەستەواژەیەدا باری ئاوێتەیی زۆر پتەو نیە، چونکە دەمکاتی ڕابردووی هەیە، وەك:

من نیم : من نەبووم، تۆ نیت : تۆ نەبوویت، ئەو نیە : ئەو نەبوو...

ئێمە نین: ئێمە نەبووین، ئێوە نین: ئێوە نەبوون، ئەوان نین: ئەوان نەبوون

لە لایەکی ترەوە، ئەو ڕستانەی پێشەوە دەتوانن ڕستەی (نیاز) و ڕستەی (گومان) چێ بکەن، وەك:

- ڕستەی نیاز:

من (نی)م: بریا من (نە) بام

ئێمە (نی)ین: بریا ئێمە (نە) باین

- ڕستەی گومان:

من (نی)م: ڕەنگە من (نە)بم

ئێمە (نی)ین: ڕەنگە ئێمە (نە)بین

کەواتە، جارێکی تر دۆخی نیشانەی (نی) هەڵوەشاوەتەوە و بوە بە دۆخی (نە). بە کۆی ئەو پاساوانەی سەرەوە، نیشانەی نەرێ (نی) تایبەتە بە مۆرفیمی ئێستایی (ـە). نەك ئاوێتەیەك لە مۆرفیمی ئێستایی و توخمی کاری بوون، بۆ پاساودانی ئەم ڕاستکردنەوەیە، دەتوانین سەرنجێك بدەین لە نموونەی کەسی سێیەمی تاك، وەك: (ئەمە ئەو نیـە). لە ئیرەدا، مۆرفیمی ئێستایی (ـە) وەك توخمی کاری (بوون) بەرجەستەیە، کەچی ئامرازی (نی) بەکارهێنراوە، بە واتایەکی تر مۆرفیمی ئێستایی تێکەڵ نەبوە بە نیشانەی (نە) تا بی کات بە (نی). کەواتە، نیشانەی دۆخی نەرێ دیاری دەکات لە ئاستی ڕێژەی کاری بووندا، کە بە ڕاستەوخۆیی بە مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەربڕابێت.

نیشانەی پرسیار (کوا؟) بریتیە لە کەرەستەیەکی بەکار بۆ جوداکرنەوەی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە جێناوەکانی (م، یت، ـە، ین، ن، ن)، لە ڕاستیدا، دەرکەوتنی سێتە جێناوەکە بە ڕوخساری (م، یت، ـە، ین، ن، ن) و قفڵ بوونی دەستەواژەی (کوا؟) لە سەر یەك باری ڕێزمانی، بریتیە لە پاساوێك بۆ هەبوونی (جێناوی بارگاوی).

بە هەمان شێوازی دەستەواژەکانی (کوا، ئەوەتا، کامەتا، ...)، ئامرازێکی تر هەیە لە چەشنی (وا)، کە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)ی تواندۆتەوە و خۆی قفڵ کردوە لەسەری، وەك:

من وا(م) لە ئەوێ، تۆ وا (یت) لە ئەوێ، ئەو وا (-) لە ئەوێ

ئێمە وا (ین) لە ئەوێ، ئێوە وا (ن) لە ئەوێ، ئەوان وا (ن) لە ئەوێ

لە هەندێك شێوازدا، دەستەواژەی (وا) بە (ها) گۆ دەکرێت، وەك شێوەزاری گەرمیان. لە بەرانبەردا، لە ئامرازی (وا)دا، بە واتای (وەها، ئاوەها، ئاوها) مۆرفیمی ئێستایی هەرس نابێت و ناتوێتەوە لە ئامرازەکەدا، وەك: ئەو (وا)یە و تۆ (وا) مەبە.

سەرچاوە:

- د. شێرکۆ بابان، گشت کارەکانی خۆمان لەسەر ڕێزمانی (بوونو هەبوون) و ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (باسکراو لە دەستپێکدا).
- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.

# کەرتی دووەم

## ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ـە)

بە پلەی دووەم لە پاش مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، ئێمە منەتبار و قەرزداری ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ـە)ین، چونکە ئەم ئامرازەیش وەك چرایەکی دەستی بە کار دەهێنرا، چی لە شیکاری ڕێزمانیدا و چی لە شیکاری دەنگسازیدا. یان، وەك ئەندازەیەك بەکار دەهێنرا بۆ ساغکردنەوەی فۆرمی فۆنەتیکی مۆرفیمی ئێستایی. لە سەرەتادا، وامان دەزانی کە ئەم ئامرازە ڕەسەن نیە و بریتیە لە دیوێکی (سواو) لە ئامرازە ئاراستەگەرەکان، وەك ئامرازەکانی (بە) و (بۆ)، بەلاَم لە پاشتردا ئەو گۆڕەپانەمان دیاریکرد کە ئەم ئامرازە ڕەسەنە گەمەی ڕێزمانی خۆی تێدا دا دەمەزرێنێت. لە یەکەم قۆناغدا، دۆزرایەوە کە نیشتمانی ئەم ئامرازە زێتەلَە بریتیە لە (ڕێزمانی کار)، نەك هیچ بابەتێکی دی، چونکە ڕووداوی کار ڕاگوێز دەکات بۆ سەر پێگەیەکی ئاوەلَکاری لە خانەی {٩-}دا، لە (پلیکانەی ڕستە)دا. لە لایەکی ترەوە، بە بەراورد بە زمانی عەرەبی و ئنگلیزی و فەرەنسی، ئەم ئامرازە ڕێزمانێکی مۆرکاوی هەیە، چونکە کارلێکی نێوان هەردوو ڕەگەزی (ئامراز پەیوەندی) و (ئاوەلَکار) لە یەکتری جودا دەکاتەوە. بە ڕاستی، ڕێزمانی ئەم ئامرازە مۆرکاوییە خەرەندێکی هێندە تووش و ئاسێ بوو، کە نە دەتوانرا بە ڕێزمان و بە دەنگسازی زمانانی خزمەتکراو لێك بدرێتەوە، مەگەر بە هەردوو تیۆریەکەی خۆمان (زەبری بزوێن) و (پلیکانەی ڕستە). ئەو دوو تیۆریەی کە گوێی دەستی ئێمەن لە زمانەوانی سەرتاسەریدا.

# بابەتی پێنجەم

## جیاوازی نێوان ئامرازی کار و ئامرازی ئاوەڵگوزارە[٧]

لە پێناوی ئەو ئامانجەدا کە بتوانین ئامرازی نێو ڕووداوی کار و ئامرازی ئاوەڵگوزارە لە یەکتری هاوێر بکەین، دەشێت لە هەندێك ڕووبەردا بابەتەکان بخەینە بەر شرۆڤەکاری. بە داخەوە، لە ڕێزمانی کوردیدا، هێشتا پەی نەبردراوە بە جەنگەڵی سەختی (ئامرازی پەیوەندی) و هێشتا بە هوردی بنەواشەکەی دیاری نەکراوە.

**١/٥: بەشێك لە (کۆمەڵەی ناو):**

ئامرازی (لە) دەتوانێت بەشێك لەکۆمەڵەی (ناو) جودا بکاتەوە، وەك:

(١): هەندێك لە میوانەکان هاتن

(٢): لە نانەکەم خوارد، یان: (بەشێك لە نانەکەم خوارد)

لە نموونەی یەکەمدا، (هەندێك لە میوانەکان) بریتیە لە (کۆمەڵەی ناو) و ئەو کۆمەڵەیە لە ئەرکی (بکەر)دایە و هیچ پەیوەندییەکی نیە بە کۆمەڵەی کارەوە. لە گەڵ ئەوەدا، ئەو دەستەواژەیە (هەندێك لە میوانەکان) دەشێت بخرێتەسەر ئەرکی (بەرکار)، وەك:

(هەندێك لە میوانەکان)م بینی

لە ئێرەدا، ناتوانین بڵێین: ئەم دەستەواژەیە پەیوەندی بە کارەوە نیە، چونکە ئەرکی (بەرکار) لە ژێر ڕکێفی کۆمەڵەی کاردایە. بەهەمان شێوە، لە ڕستەی دوەمدا (لە

---

٧ گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژمارە (٤٧/ ٢٠٠٩).

ئانەکە) یان (بەشێك لە نانەکە) بریتیە لە (بەرکار) و لە ئێرەیشدا، پەیوەندی هەیە بە کۆمەڵەی کارەوە. لە ڕاستیدا، ئەم جۆرە ئامرازە (لە) چەند سیمایەك دەنوێنێت، وەك:

یەکەم: ئامرازی (لە) دەتوانێت بچێتە نێو قەوارەی کۆمەڵەی ناوەوە و توخمی (بەش) لە بابەتی (گشت) جودا بکاتەوە.

دووەم: ئەو کردەوەیەی کە ئامرازی (لە) دەی نوێنێت هەموو کۆمەڵەیەك دەگرێتەوە کە سیمای (بەش کردن) و (ژماردن) هەڵ بگرێت. بۆ نموونە، (کۆمەڵەی ناو) لە چەندین جێدا هەیە و لە هەر جێیەکدا ئامرازی (لە) کاریگەری خۆی دەردەخات، وەك:

- لەرۆڵی بکەردا:

(دوو کەس لە میوانەکان) گەیشتن

- لەرۆڵی بەرکاردا:

(نەختێك لە ئاوەکە)م خواردەوە

- لە رۆڵی بەرکاری ناڕاستەوخۆدا:

من نامە دەنێرم بۆ (هەندێك لە برادەران)

- تەنانەت لە هەندێك جێدا، دوو ئامرازی (لە) دەتوانن لە هەمان رستەدا کۆ ببێتەوە، بەڵام بۆ دوو ئەرکی جیاواز، وەك:

نامەکەم نووسی لە (بەشێك لە دیوارەکە)

بێگومان ئامرازی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کاری ئامرازدار (نووسین لە ...) و ئامرازی دووەم دەگەڕێتەوە بۆ (بەش)ێك لە (گشت)، یان بە ڕاستەوخۆیی بەشێکە لە کەرەستەی (هەندێك لە ...)، (بەشێك لە ...)

سێیەم: ئەم جۆرە بەکارهێنانە سیمای (چەندایەتی) هەڵ دەگرێت، چونکە لە دۆخی پرسیاردا ئامرازی پرسیار (چەند؟) دەکەوێتەکار.

چوارەم: بەکارهێنانی ئامرازی (لە) لە ناو کۆمەڵەی ناودا سیمایەکی گشتی هەیە. هەر لە بەر ئەوە، دەشێت بکرێت بە بابەتێکی سەربەخۆ و لە پاشتردا لە ئەرکی ( بکەر و بەرکار)دا باس بکرێت.

پێنجەم: لە ئاخاوتنی کوردیدا، لە دەمکاتی رابردووی تێپەڕدا، هەندێك جار (بە زێدەڕۆیی) جێناوی لکاو باز دەداتە پێش ئامرازی (لە)، وەك:

(بەشێك لە نانەکە)م خوارد ← (بەشێك)م لە نانەکە خوارد

(نەختێك لە ئاوەکە)م خواردەوە ← (نەختێك)م لە ئاوەکە خواردەوە

(هەندێك لە میوانەکان)م بینی ← (هەندێك)م لە میوانەکان بینی

لە ئایندەدا، دەبێت دەزگا باڵاکانی زمان ئەم دووفاقییە یەکلایی بکەنەوە. بە بۆچوونی ئێمە، نموونەکانی (دەستەڕاست) ڕێزمانیترن.

شەشەم: لە ڕێزمانی کوردیدا، ڕێ دراوە کە ئەو کەرتەی پێش ئامرازی (لە) لابردرێت، وەك:

(بەشێك لە نانەکە)م خوارد ← (... لە نانەکە)م خوارد

(نەختێك لە ئاوەکە)م خواردەوە ← (... لە ئاوەکە)م خواردەوە

(هەندێك لە میوانەکان)م بینی ← (... لە میوانەکان)م بینی

هەفتەم: سەرەڕای ئەوە، ڕێ دراوە کە ئەو کەرتەی پاش ئامرازی (لە) لابردرێت و بکرێت بە جێناوی لکاو، وەك:

(بەشێك لە نانەکە)م خوارد ← (... لێ یـ)م خوارد

(نەختێك لەئاوەکە)م خواردەوە ← (...لێ یـ)م خواردەوە

(هەندێك لە میوانەکان)م بینی ← (... لێ یان)م بینی

هەشتەم: لە پەرسەندنێکی تردا، جێناوی لکاوەکان پاشەکشێیان پێ کراوە، وەك:

(... لێ یـ)م خوارد ← (... لێ )م خوارد(-)

(...لێ یـ)م خواردەوە ← (...لێ )م خوارد (-)ەوە

(... لێ یان)م بینی ← (... لێ )م بینی (ن)

## ٢/٥: جیاوازی نێوان ئامرازی کار و ئامرازی ئاوەڵگوزارە:

بە سەرنجێکی هورد و بەدەستێکی وەستایانە، دەتوانین ئامرازی کاری ئامرازدار و ئامرازی ئاوەڵگوزارە لە یەکتری جودا بکەینەوە. لەئەم کردەوەیەدا چەند خاڵێك هەیە کە دەبێت پێیدا برۆین، وەك:

یەکەم: ئاوەڵگوزارە سیمای (گشتایەتی) هەڵ دەگرێت، کەچی کاری ئامرازدار سیمای (تایبەتایەتی) هەڵ دەگرێت. بە واتایەکی دی، دەتوانین بڵێین: ئاوەڵگوزارە گشتیە و دەشێت بۆ هەموو کارێك بەکاربهێنرێت، وەك:

| | |
|---|---|
| لە هەولێر | دەژیم |
| لە هەولێر | ئیش دەکەم |
| لە هەولێر | نامە دەنووسم |
| لە هەولێر | مامۆستام |
| لە هەولێر | میوە هەیە |
| ........ | .......... |

له بەرانبەردا، ئامرازی کار باڵێکی تایبەتی له ڕووداوی هەندێك له کارەکان پەیدا دەکات، وەك:

من نامەکه دەدەم (بە) ئەوان

دەرزیەکه چەقی (له) دەستم

منداڵەکه ترسا (له) پشیلەکه

له ئەم نموونانەدا، ئاڵ و گۆڕ پەسەند نیه وەرگرتنی هەر (ئامراز)ێك بریتیه له ئاکارێکی تایبەتی بۆ هەر کارێك. بۆ نموونه، وەك چۆن کارەکانی (دان، چەقین، ترسان) هەن و بەرجەستەن، هەر ئاوهایش ئەم کارانه دیوی ئامرازداریان هەیه، وەك: (دان له ...، چەقین له ...، ترسان له ...).

دووەم: ئاوەڵگوزاره بریتیه له تەختی ڕسته و له ئەو مافوورەی که له ژێر ڕستەکەدا رادەخرێت. بەواتایەکی دی، ئەو مافووره، یان ئەو تەختە دەشێت له ژێر هەموو رستەیەکدا رابخرێت. بەرانبەر بە ئەو تەختە گشتیه، کاری ئامرازدار باڵێکی تایبەتی هەیه و له ئەو باڵەدا ئامرازێکی وەرگرتوه و ئەو ئامرازەیش لەگەڵ میکانیزمی رووداوەکەیدا خۆی لواندوه. کەواته، ئامرازەکه تایبەتیه به کارێك و نەدەتوانرێت کارەکه بگۆڕدرێت و نەدەتوانرێت ئامرازەکه بگۆڕدرێت.

سێیەم: وەك ئاوەڵگوزاره و کاری ئامرازدار بریتین له دوو تشتی لێکجودا، دەتوانرێت هەردوو بابەتەکه له یەك ڕستەدا کۆبکرێنەوە.

چوارەم: وەك حەشارگەیەکی رێزمانەکه، ئامرازی پەیوەندی (ـە) تەنها و تەنها هەر له کاری ئامرازدا هەیه و له ئاوەڵگوزارەدا نیه. ئەم دیاردەیەیش دەتوانێت کەڵکی هەبێت بۆ جودا کردنەوەی هەردوو بابەتەکه. بۆ نموونه، له هەندێك کاری ئامرازداردا ئامرازی (بە) هەیه و ئەو ئامرازه دەشێت بکرێت به ئامرازی (ـە)، وەك:

گەیشتم (بە) هەولێر ⇐ گەیشتم (ـە) هەولێر

دام (بە) ئێوە ⇐ دامـ (ـە) ئێوە

فرۆشتم (بە) شیلان ⇐ فرۆشتمـ (ـە) شیلان

بـە ئـەم شـێوەیە، وەك ئـامرازی (ـە) پسوولەی نیـە لـە خـاکی ئـاوەڵگوزارەدا، ناتوانێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێـت لـە ئەوێـدا. یـان، ئەگـەر ئـەو ڕۆڵەی گێـڕا، ئـەوا بابەتەکـە دەبڕزکێنێت بە دیوی کاری ئامرازداردا. بۆ نموونە، ئەگەر دوو ئامرازی (بە) بەکارهاتن بۆ ئاوەڵگوزارە و بۆ کاری ئامرازدار، وەك:

(بە) فڕۆکە گەیشتین (بە) هەولێر

ئەوا، ئامرازی دووەم دەشێت بکرێت بە ئامرازی (ـە).

وەك:

(بە) فڕۆکە گەیشتین (ـە) هەولێر

لە بەرانبەردا، بەهیچ جۆرێك ئامرازی یەکەم ئەوە پەسەند ناکات کە بکرێت بە ئامرازی (ـە). کەواتە، ئامرازی پەیوەندی (ـە) بریتیە لە جوانترین و کاریگەرترین پێوەر بۆ یەکلایی کردنەوەی ئامرازی (ئاوەڵگوزارە) لە ئامرازی (کاری ئامرازدار). بە تایبەتیش لە ئاستی ئامرازی (بە)دا، وەك لە ئەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت، وەك:

(بە) دەست نامەکەم دا (بە) شیلان

(بە) دوو دینار نامەکەم دا (بە) شیلان

(بە) شەو نامەکەم دا (بە) شیلان

(بە) بێ دەنگی نامەکەم دا (بە) شیلان

لەئەو نموونانەدا، ئامرازی یەکەم لە ڕێزمانی ئاوەڵگوزارەیە و نەفرین دەکات لە ئامرازی (ـە). بەڵام لە ئامرازی دووەمدا کارەکە ئامرازدارە و بۆی هەیە ببێت بە (ـە). سەبارەت بە ئامرازی (بۆ) ئەم ئامرازەیش بۆی هەیە لە کاری ئامرازداردا بکرێت بە ئامرازی (ـە)، بەڵام نەختێك بە لەنگی. بۆ نموونە، لەئەم کارانەدا ئامرازی (بۆ) باڵێکی هەیە لە ڕووداوی کارەکەدا.

کشان بۆ... : سەربازەکە کشا بۆ دواوە

ڕۆیشتن بۆ...: ڕۆیشتم بۆ ئەوێ

چوون بۆ...: چووم بۆ ئەوێ

هاتن بۆ...:   هاتم بۆ ئەوێ

پەڕین بۆ...: پەڕی بۆ دەرەوە

فڕین بۆ....: فڕی  بۆ ئاسمان

هێنان بۆ...: هێنام بۆ ئەوێ

بردن بۆ....بردم بۆ هەولێر

ناردن بۆ : ناردم بۆ هەولێر

لە ئەم ڕستانەدا، ئەگەر زۆر بکەین لە ئامرازی (بۆ)، دەتوانین بی کەین بەئامرازی (ـە)، وەك:

کشان بۆ...: سووپاکە کشایـە دواوە

ڕۆیشتی بۆ... : ڕۆیشتمـە ئەوێ

چوون بۆ... : چوومـە ئەوێ

هاتن بۆ ....: هاتمـە لاتان

پەڕین بۆ... : پەڕییـە دەرەوە

فڕین بۆ... : فڕیـە ئاسمان

هێنان بۆ... : هێنامـە ئەوێ

بردن بۆ... : بردمـە هەولێر

ناردن بۆ... : ناردمـە هەولێر

بێگومان، ئامرازی (ـە) بە دروستی لە جێی ئامرازی (بۆ) دانانیشێت و ناترنجێتە ناو چێوەرمەی واتاکە. ئەمەیش کاتێك دەردەکەوێت کە بارگەی ئامرازەکە بکەین بە ناوی کەسی، یان بە جێناوی کەسی، وەك:

ناردم بۆ شیلان، ناردم بۆ تۆ

ناشێت بکرێت بە(•):

ناردم (ـە) شیلان(*)، ناردم (ـە) تۆ(*)

بەڵام دەشێت ڕێزمانی ئامرازی (ـە) خۆی خۆی ڕاست بکاتەوە و داوای ئاوەڵکارێك بکات لە چەشنی (لا، ...) وەك:

ناردمـە لای شیلان

ناردمـە لای تۆ

لە ئەم بارەیشدا، واتای ڕستەکە دەبزرکێت و پشت دەکات لە واتای ئامرازی (بۆ) لە کاری ئامرازداری (ناردن بۆ...)دا. بەرانبەر بە ئەوەی گوترا، لە دیوی ئاوەڵگوزارەدا، بە هیچ جۆرێك پەسەند نیە کە ئێمە ئامرازی (بۆ) بگۆڕین بە (ـە)، چونکە ناڕێزمان پەیدا دەبێت، وەك:

بۆ تۆ نامەکەم برد بۆ ئەوێ

لە ئەم ڕستەیەدا، ئاوەڵگوزارەی (بۆ تۆ)، بە واتای (لە بەر خاتری تۆ)، یان (لە پێناوی تۆدا)، ناتوانێت ئامرازەکە بگۆڕێت، چونکە ئاوەڵگوزارەیە و ئامرازی پەیوەندی (ـە)یش لە ئاوەڵگوزارەدا نیە. بەڵام لەباری دووەمدا، چونکە ئاوەڵگوزارە نیە و ئامرازی (بۆ) باڵێکی تەرخان کردوە لە ڕووداوی کاری (بردن)دا، دەشێت بگۆڕدرێت بە ئامرازی (ـە)، وەك:

بۆ تۆ نامەکەم بردە ئەوێ

## ٣/٥: پوختەکاری:

لە کۆمەڵەی ناودا، ئامرازی (لە) رۆڵێکی کاریگەری هەیە لە جودا کردنەوەی (بەشێك) لە (کۆمەڵەیەك). ئەم ئارێشەیە دەشێت بە هوردی یەکلایی بکرێتەوە و ئەوسات لە ئاستی کۆلکەکانی رستەدا، بە تایبەتی لە ئاستی کۆلکەی (بەرکار)دا، سەودا بکرێت.

لە دەمکاتی رابردووی تێپەڕدا، زۆر جار بە نارەوا جێناوی لکاو باز دەداتە پێش ئامرازی (لە) و بەرکارەکە دوولەت دەکات، وەك: (بەشێك لە نانەکە خوارد).

لە رێزمانی کوردیدا، ڕێ دراوە کە ئەو کەرتەی پێش ئامرازی (لە) بپەڕێنرێت، وەك: (لە نانەکە خوارد).

ئامرازەکانی (لە، بە، بۆ) دەتوانن لە (ئاوەڵگوزارە) و لە میکانیزمی ڕووداوی کاردا ئەرك بگێڕن، بەڵام ئامرازی (ـە) هەر لە میکانیزمی ڕووداوی کاردا دەتوانێت ئەرك بنوێنێت.

ئامرازی ئاوەڵگوزارە رایەخێکی ئاوەڵکاری ڕادەخات و زەمینەیەکی گشتی بۆ (ڕستە) دادەمەزرێنێت، بەڵام ئامرازی (کار) باڵێکی سەربار و تایبەتی لە ڕووداوی کاردا چێ دەکات و دیوێکی تری لێ پەیدا دەکات.

ئامرازی ئاوەڵگوزارە (باری گشتی) دەتوێنێت لە ئاستی هەر ڕستەیەکدا، بەلاّم ئامرازی (کار) باری تایبەتی چێ دەکات و هەندێك لە ئامرازەکان (بە بژار) دەچنەسەر هەندێك لە کارەکان.

لە ڕێزمانی کاردا، ئامرازەکانی کار (بە، بۆ) بۆیان هەیە ببن بە ئامرازی (ـە)، بەلاّم بە ڕێزمانێکی لەنگ. لە زمانی نووسیندا، ناشێت و نابێت هیچ ئامرازێك سنوور ببەزێنێت، یان سنووری ببەزێنرێت.

سەرچاوە:

- د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا، هەولێر ٢٠٠٩
- د. شێرکۆ بابان، ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە ڕێزمانی کاری ئاسادەدا گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (١)، هەولێر ٢٠٠٩
- د. ڕەفیق شوانی، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠١
- د. وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەکی تر لە زمانەوانی، هەولێر ٢٠٠٤

# بابەتی شەشەم

## ئامرازی پەیوەندی (ـە) لەبەر زووومی لێکۆڵینەوەدا

١/٦: دەستپێك:

تا ئێستا نزیکەی (١٠) نووسینمان بڵاو کردوەتەوە لە سەر ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ە)، بەڵام هیشتا بە هوردی و بە سفتی نەچوەتە بەر زووومی لێکۆڵینەوە. لە راستیدا، رەنگە زانیارییەکان لە پێشتردا بڵاو کرابێتنەوە، بەڵام مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە بەشێوازێکی تر و بە دارشتنێکی تر بی خەینە بەر دیدی توێژەرانی ئازیز. لە ئەم نووسینەدا، بە هیواین بتوانین گوڕ و تینێکی گەرمتر و کاریگەرتر ببەخشین بە ڕێزمانی ئەم مۆرفیمە گرنگە. ئێمە لە ئەو باوەڕەداین کە ئەو سەدان کەسەی کە لە بیست ساڵی رابردوودا بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرایان وەرگرتوە لە زانکۆکانی بەغدا و کوردستان، ئەگەر هەر هەموویان ببووبان بە نووسەر (ڕێزماننووس)، هێشتا هەر کەم بوو بۆ خزمەتکردنی زمانی کوردی. بە راستی، ئەو کەسانە کراون بە (مامۆستا) و هیچیان کەسیان نەبوە بە (توێژەر) ، یان بە (مامۆستا و توێژەر). واتە، بە دەگمەن نەبێت، کەسیان نەبوە بە (پیشەوەر) لە ئەو بوارە گرنگەدا، مەگەر هەردوو مامۆستا (د. نەریمان خۆشناو) و (د. عەبدولواحید موشیر). بەداخەوە، وەك سەدان نامەی ماستەر و دکتۆرا بەخشراوە، دەبا هەر هیچ نەبا دەیان نووسەریان لیٚ بکەوتایەتەوە، بە تایبەتی لە بوارەکانی زمان و ڕێزماندا.

**٢/٦: ئەركە ڕەسەنەكانی نیشانەی (ە):**

وەك لە نووسینەكانی پێشتردا بلاّو كراوەتەوە، لە ئاستی ئامرازی پەیوەندی (ە)دا چەند ئەركێكی ڕەسەن هەن، وەك:

- ئەركی یەكەم:

لە ئەم ئەركەدا، ئاكاری (ڕاگوێزكردن)ی ڕووداوی كار بۆ سەر پێگەیەكی ئاوەڵكار لە ئارادایە. واتە، ئامرازی (ە) ڕووداوی (كار)ێك دەبەستێت بە (ئاوەڵكار)ێكەوە، بە (ڕاگوێز)ێكی داینامیكیانە و ئاراستەدار، وەك:

پشیلەكە چوو (ە) ژێر كورسیەكە

بە سەرنجێكی هورد، دەردەكەوێت كە ڕووداوی كاری (چوون) ڕاگوێزراوە بۆ سەر ئاوەڵكاری (ژێر). لە ئەم میكانیزمەدا، ئامرازی (ە) داینامیزمی تێدا هەیە و بە ئەو داینامیزمە ڕووداوی كاری (چوون)ی گەیاندوە بە یەكێك لە (ئاوەڵكار)ەكانی (ناو)ی (كورسی). ڕەسەنێتی ئەم ئەركەی ئامرازی (ە) بە ئەوەدا دەردەكەوێت كە ڕیزبەندێكی ڕێزمانی و پتەو پەیدا بوە، لە چەشنی:

[ كار | ئامرازی (ە) | ئاوەڵكار ]

لە ئەم ڕیزبەندەدا، نە (جێگۆركێ) و نە (لابردن)ی یەكێك لە كۆڵەكەكان پەسەند نابێت، چونكە بزاڤی (ڕاگوێزكردن) لە ناو دەچێت. لەلایەكی ترەوە، بە هیچ جۆرێك ناتوانین میكانیزمی (خستنەبری) پیادە بكەین، بە گۆڕینی ئامرازی (ە) بە ئامرازێكی تر، وەك (بە):

پشیلەكە چوو (بە) ژێر كورسیەكە[*]

بە هەمان شێواز، ناتوانین بڵێین:

پشیلەکە چوو (بۆ) ژێر کورسیەکە(*)

یان،

پشیلەکە چوو (لە) ژێر کورسیەکە(*)

لە ئەم نموونانەدا، کە بە هێمای ئەستێرە(*) نەخشێنراون، (لێک ترازان)ی ڕێزمانی و واتایی بەرپا بوە، چونکە دەستدرێژی کراوەتە سەر ئەرکە ڕێزمانیە ڕەسەنەکەی ئامرازی (ڕاگوێزتن).

- ئەرکی دوەم:

لە ئەم ئەرکەدا، ئامرازی (ە) ڕووداوی (کار)ێک ڕاگوێز دەکات بۆ سەر (ناوەڵکار)ێکی تەواونەکراو، وەك:

ئەم پیلانەت بۆ ناچێتە سەر

لە ئەم نموونەیەدا، هەمان ڕیزبەندی (ئەرکی یەکەم) چەسپاوە، وەك {کار : ئامرازی (ە) : ناوەڵکار}، بەڵام کلکی ناوەڵکاری (سەر) قفڵ دراوە و هیچ کۆلکەیەك ناگرێتە خۆی، سەبارەت بە بەراورد لەگەڵ (ئەرکی یەکەم)دا، چەند جیاوازیەك هەیە، وەك :

یەکەم: بزاڤی (واتاگۆڕکێ) چەسپاوە، چونکە واتای چاوگی ( چوونە سەر) و (بۆ چوونە سەر) داترازاوە لە واتای چاوگی (چوونە سەر چشتێك).

دوەم: بزاڤی (واتاگۆڕکێ) لە بارێکی (تایبەتی)دا چەسپاوە، نەك لە بارێکی (گشتی)دا. بۆ نموونە، لە ئەرکی یەکەمدا بارێکی گشتی لە ئارادایە، نەك بارێکی لاوەکی و تایبەتی.

ـ ئەرکی سێیەم:

لە ئەم ئەرکە ڕەسەنەدا، ئامرازی (ە) چالاکی ڕووداوی (کار)ێك ڕاگوێز دەکات بۆ سەر ڕووداوی کارێکی تر، بۆ ئەوەی دەسپێکی ڕووداوەکەی دیاری بکات، وەك: (کەوتنە پێکەنین : خستنە پێکەنین):

منداڵەکە کەوتە پێکەنین

یان،

من منداڵەکەم خستە پێکەنین

بە سەرنجێکی هورد لە ئەو دوو نموونەیە، دەردەکەوێت کە ئامرازی (ە) توانیویەتی دەستپێکی ڕووداوی کاری (پێکەنین) دیاری بکات، چی بە کاری (تێنەپەڕ)ی (کەوتن) و چی بەکاری (تێپەڕ)ی (خستن). لەلایەکی ترەوە، ئامرازی (ە) بۆی هەیە کە بنجی کارەکە وەربگرێت، وەك: (منداڵەکە بوو(ە) گری). لە ئێرەدا، بنجی کاری (گریان) بەکارهێنراوە. یان دەشێت کۆلکەیەکی واتا گۆڕ وەربگرێت، وەك: (مەکینەکە کەوتە ئیش)، بەواتای: (مەکینەکە کەوتە ئیش کردن).

ـ ئەرکی چوارەم:

لە ئەم ئەرکەدا، ئامرازی (ە) دەچێتە سەر ڕێژەکانی کاری (هاتن) و ڕووداوەکەی ڕاگوێز دەکات بۆ سەر کارێکی (تێپەڕ) وەك: (نامەکە هاتە نووسین). کەواتە، ئامرازەکە نووساوە بە کلکی کاری تێنەپەڕی (هاتن)ەوە و ڕاگوێزی کردوە بۆ سەر (ناو)ێك لە قاڵبی (چاوگی تێپەڕ)دا. لە شێوازی کرمانجی ژووروودا، ڕێژەکانی کاری (هاتن) جووت دەبن لەگەڵ ئامرای (ە) و ڕێژەی (بکەرنادیار) چێ دەکەن بۆ ئەو (چاوگە تێپەڕ)ەی کە دەکەوێتە پاش ئامرازی (ە)، وەك:

{ڕێژەی کار (هاتن) : ئامرازی (ە) : چاوگی تێپەڕ}

٢/٦: ئەرکە نارەسەنەکانی ئامرازی (ە):

لە کۆپلەی پێشوودا، لە سێ نموونەدا ئامرازەکانی پەیوەندی (بە، بۆ، لە) خرانە جێی ئامرازی (ە)، بەڵام لێکترازانی ڕێزمانی و واتایی پەیدابوون، چونکە ئەو سێ ئامرازە لە ئەرکی ڕەسەنی خۆیاندا نەبوون. بە هەمان شێواز، کاتێک کە لە باری پێچەوانەدا، ئامرازی (ە) دەکرێت بە جێگرەوەی ئەو سێ ئامرازە (ناڕێکی) ڕێزمانی پەیدا دەبێت. لە ئاخاوتنی کوردەواریدا، ئەم جۆرە سووککردنە کەم و زۆر دەچەسپێت، بەڵام پەڕیوەتەوە بۆ نێو (زمانی نووسین) و لە نووسینی نووسەران و ڕێزماننووساندا بە بێ خەبەری و بە هەڕەمەکی دەچەسپێت. بۆ نموونە، لە ئەم ڕستانەی خوارەوەدا، ئامرازی(ە) خراوەتە بەر ئەرکێکی (نارەسەن):

شیلان بوو (ە) مامۆستا، یان: شیلان چوو (ە) بازاڕ

لە باری ئەرکی ڕەسەندا دەتوانرێت بگوترێت:

شیلان بوو (بە) مامۆستا، یان شیلان چوو (بۆ) بازاڕ

بە واتایەکی تر، لە نموونەکانی ئامرازی (ە) پەرێزی ئامرازەکان تێکەڵ و پێکەڵ کراوە، بەڵام لە نموونەکانی ئامرازەکانی (بە) و (بۆ)دا پەرێزەکان بە جوانی لە یەکتری بڕکراون بە (ڕێزمان). لە نووسینی زۆربەی نووسەراندا و تەنانەت لە هی ڕێزماننووساندا، ئەو دوو دەستە نموونەیە بە هەڕەمەکی و بەبێ ئاگایی دەکەونە بەر نووکی پێنووس و هیچ (فلتەر)ێك و (پارزنگ)ێك ناخەنە نێوان (زمانی ئاخاوتن) و (زمانی نووسین).

### ٤/٦: ئامرازی (بە) و ئامرازی (ە):

لە ئاخاوتنی کوردیدا، نزیکترین خزمی ئامرازی ([redacted]) بریتیە لە ئامرازی (بە)، چونکە لە ئاماری زۆربەی بارەکانی (خستنەبری)دا، ئامرازی (ە) جێی ئامرازی (بە) دەگرێتەوە. بێگومان، ئامرازی (بە) ئەرکی زۆری هەیە و ناشێت هەروا بە سووك و ئاسان بازی بە سەردا بدەین، وەك:

١. ئەرکی دەستەبەری ڕووداوی کار، وەك:

شیلان (بە) دەست نان دەخوات

٢. ئەرکی شێوازی ڕوودانی کار، وەك:

شیلان (بە) هێواشی نان دەخوات

٣. ئەرکی ئاوەڵکاری کات

شیلان (بە) شەو نان دەخوات

٤. ئەرکی جوێنی سپی، وەك:

سەری (بە) گۆڕی باوکی

٥. ئەرکی تر، وەك:

پڕ (بە) باڵا، چاو (بە) کل، دەم (بە) پێکەنین، (بە) هێز، (بە)سۆز

٦ـ ئامرازی (بە) لە قەوارەی کاردا:

| ئامرازی (بە) | ئامرازی (ـە) |
| --- | --- |
| شیلان نەبوە بە ماموستا | شیلان نەبومتـە ماموستا |
| من ئاوەکەم کردوە بە سەهۆڵ | من ئاوەکەم کردومتـە سەهۆڵ |
| نامەکەت گەیشت بە من | نامەکەت گەیشتـە من |
| کێ نامەکە دەدات بە شیلان؟ | کێ نامەکە دەداتـە شیلان؟ |

بێگومان، ئەرکی ئامرازی (بە) زۆر بەر بلاّوە و ئالۆزە لە ئەوانەی سەر ئەو خشتەیەی سەرەوە زۆرترە. بەلاّم سەبارەت بە سەردێری باسەکە، جۆرەکانی تر (١، ٢، ٣، ٤، ٥)، بێجگە لە جۆری (٦)، هیچ پەیوەندیەکیان نیە بە ئامرازی (ە)وە، واتە، تەنها هەر لە جۆری (٦)دا دەتوانین ئامرازی (ە) بخەینە جێی ئامرازی (بە). لە نموونەکانی (دەستە ڕاست)دا، دەشێت (تەرازووی ڕێزمان) بە کار بهێنین و ئامرازی (بە) بخەینەوە جێی ڕەسەنی خۆی. واتە، لە ئەو ڕستانەی (دەستە چەپ)دا، ئامرازی (ە) بە جی بهێڵین بۆ (زمانی ئاخاوتن)، وەك:

ـ زمانی ئاخاوتن:

شیلان نەبومتە ماموستا

ـ زمانی نووسین:

شیلان نەبوە بە ماموستا

بێگومان، ئەم دووفاقیە قفڵ دەبێت بە دیوی ئامرازی (ە)دا، ئەگەر ئاوەڵکار بەکار بهێنرێت، وەك:

- زمانی ئاخاوتن:

**شیلان کەوت (ە) نێو ئاوەکە**

- زمانی نووسین:

**(هەمان ڕستەی زمانی ئاخاوتن)**

**٥/٦: ئامرازی (بۆ) و ئامرازی (ە):**

**بە پێی ئاماری بارەکانی خستنەبری، لە پاش ئامرازی (بە)، ئامرازی (ە) بە پلەی دووەم دەخرێتە بری ئامرازی (بۆ)، وەك:**

**دەڕۆم ([redacted]) هەولێر**

**من تۆ دەنێرم ([redacted]) دهۆك**

لەجیاتی:

**دەڕۆم ([redacted]) هەولێر**

**من تۆ دەنێرم ([redacted]) دهۆك**

**لە ئەم نموونانەدا، بزافی ئاراستەداری لە ئارادایە و ئامرازی (بۆ) و جێگرەکەی (ە) چوونەتە سەر قەوارەی کارەکە. لە باری تردا، کە ئامرازی (بۆ) واتای (لەبۆ)، یان (لەپێناو) ببەخشێت، ئەوا بە هیچ جۆرێك ئەو خستنە بریە ناچەسپێت، وەك:**

**من (بۆ) تۆ ئیش دەکەم**

بەواتای:

**من (لەبۆ) تۆ ئیش دەکەم**

**٦/٦: ئامرازی (لە) و ئامرازی (ە):**

خستنەبری ئامرازی (ە) و ئامرازی (لە) زۆر زۆر لاوازە و نموونەی زۆر کەمە لە زمانی ئاخاوتندا، مەگەر لە ئاستە بەرزەکانی ڕێزمانی کاردا، وەك:

ـ زمانی ئاخاوتن:

شیلان رووی کرد (ە) دیوارەکە

زمانی نووسین:

شیلان رووی کرد (لە) دیوارەکە

بێگومان، بە زەبری (بەرکار)ی (روو) و بەرکاری ناراستەوخۆ، واتای کاری (کردن) گۆڕاوە. لە ئەم ئاستەدا بەرزەی (واتا گۆڕکێ)دا، دیاردەی خستنەبری چەسپاوە و ئامرازی (ە) توانیویەتی جێگای ئامرازی (لە) بگرێتەوە.

**٧/٦: ئامرازی (ە) و پاشپرتی (دا):**

پاشپرتی (دا) زۆر جار لەتەك ئامرازی (ە) دەردەکەوێت و زۆر جاریش ئەو بارە نارێکە دەگوێزرێتەوە بۆ نێو (زمانی نووسین)، وەك:

ختووکەیەك هاتە دڵما

دەرزییەکە چوو(ە) دەستی شیلانا

لە دیوی زمانی نووسیندا، دەگوترێت:

ختووکەیەك هات (بە) دڵمدا

دەرزییەکە چوو (بە) دەستی شیلاندا

بە داخەوە، لە زمانی نووسیندا، ئەو جۆرە سووککردنەی ئامرازی (ـە) دەبینرێت و زۆر جاریش پاشپرتی (دا) سووك دەکرێت بە کلۆرکردنی دەنگی دال. بە کورتی و بە

کوردی، لە هەر جێیەکدا کە ئامرازی (ە) پاشپرتی (دا)ی وەرگرت، ئەوا دەشێت بگۆڕدرێت بە ئامرازی (بە....دا) و بە ئەم ئارایشتە ڕێزمانیەوە بخرێتە نێو دەقی نووسینەوە.

### ٨/٦: ئامرازی (ە) و پاشپرتی (ەوە):

لە فەوارەی کاردا، ئامرازی (بە...ەوە) زۆر کەم بەکار دەهێنرێت بۆ (واتاگۆڕکێ)، وەك: {مارەکە دای (بە) شوانەکەوە}. لە ئەم نموونەیەدا، واتای کاری (دان) گۆڕاوە بۆ (دان بە...ەوە)، یان ( پێوەدان). لە ئەم جۆرە نموونەیەدا زۆر بە دەگمەن ئامرازی (ە) دەخرێتە جێ ی ئامرازی (بە). ئەمە و لە حەشارگەیەکدا، وەك: (شیلان دەچێتە دڵەوە)، ناشێت بگوترێت: (شیلان دەچێت بە دڵـەوە). لە ڕاستیدا، ئەم ڕستەیەی دوایی واتای گۆڕاوە بۆ (پێوانە بە بەراورد)، وەك: {مێزەکە ناچێت بە دەرگاکـەوە}. واتە، پێوانەی مێزەکە گەورەترە لە پێوانەی دەرگاکە و ناتوانین بە دەرگاکەدا بی پەڕێنینەوە، چونکە ناچێت پێیەوە.

### ٩/٦: پوختەکاری و گفتوگۆ:

لە سەرەتای ئەم نووسینەدا، وا هەستمان کرد کە هەر بابەتەکانی پێشوو دووبارە دەکەینەوە، بەڵام بە شێوازێکی تر و بە گوڕ و تینێکی ترەوە، لە ناوەڕاستی نووسینەوەی ئەم بابەتەدا، جارێکی تر شەقاوی بیرکردنەوە و بیر گوشین کرایەوە و نووکی خامەکەمان گەیشت بە چەند ڕووبەرێکی تر.

لە سەرەتای ئیشەکانی ئێمەوە، ئێمە وا هەستمان دەکرد کە ئامرازی (ە) بریتیە لە ئامرازێکی (سواو) و (نارێك). لە یەکەم هەنگاودا، زێری ئەم ئامرازەمان لە کتێبی (چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی)ی مامۆستا (مسعوود محەمەد)دا دۆزییەوە. لە پاشتردا،

توانیمـان سـنووری پـەڕێزی ئـامرازی (ە) دیـاری بکـەین و ئـامرازی پتـەوی (ە) جـودا بکەینەوە لە ئامرازی (جێگرەوە). هەر لەبەر ئەوە، هێڵێکی سووری ڕێزمانیمان کێشا لە نێوان ئەو دوو جورە ئامرازەدا. بـۆ نموونـە، تـا ئـەمرۆ (٢٠١٦/٣/٨)، (٣٩) کتێـب و (١٨٩) نووسینمان بڵاو کردۆتەوە و نەمان هێشتوە ئـەو هێڵە سـوورە ببـەزێنرێت، مەگـەر بـە هەڵەی چاپ و بە هەڵەی کەسانی هەڵەچن.

وەك لە پێشەوە باسکرا، ئێمە هێڵێکی سووری ڕێزمانیمان دیاریکردوە بۆ ئەوەی ڕووبەری ڕەسەنی ئـامرازی (ە) جـودا بکەینـەوە لـە ڕووبـەری ڕەسـەنی ئامرازەکـانی تـر. لـە ئـەم ئاستەدا، ڕەنگە بپرسرێت: سروشتی ئەو هێڵە سوورە چۆنە و چۆن دیاری دەکرێت؟ لـە ڕاستیدا، بە خوێندنەوە و بە تێگەیشتن لـە نووسـینەکانی ئێمـە، لـە مـەڕ ئـامرازی (ە)، دەتوانرێت ئەو سنوورە دیاری بکرێت. تەنانەت بە تێگەیشتن لە کرۆکی ئەم نووسینەی بەر دەست، دەتوانرێت ڕەش و سپی لە یەکتری جودا بکرێنەوە. لە رووی کەڵکەوە، جۆرە هێڵـی سـووری ئاوهـا کاریگـەری خـۆی دەردەخـات لـە پاککردنـەوەی (زمـانی نووسـینی ڕێزماندار) لە ماکەکانی (زمانی ئاخاوتنی ناوچەیی).

بۆ گەمارۆدانی ڕێزمانی ئامرازی (ە)، جوانترین و بەکارترین بنەما ئەوەیە کە ئەم بابەتە تەنها و تەنها هەر لە قەوارەی کاردا هەیە و لە هیچ جێیەکی تردا نیە. بۆ نموونە، زمانی کوردی دەوڵەمەندە بە ئەو مۆرفیمانەی کە ڕوخساری بزوێنی (ـە)یان هەیە، بـەڵام ئـەم ئامرازە هەر لە ئاستی (کۆمەڵەی کار)دا هەیە. لە کۆمەڵەی کاریشدا، ئامرازی (ە) دەلکێت بە کلکی کارەوە و بە هیچ جۆرێك نالکێت بە نووکی ڕێژەی کارەوە. لە ئەم ڕووەوە، ئەگەر ئامرازی (ە) بخەینە پێش کارەکە، ئـەوا دەبێـت بـی گـۆڕین بـە ئـامرازێکی دن، یـان ڕوو بکەین لە ناڕێزمان. بۆ نموونە، دەگوترێت: (پارەکەم داوە بە شیلان)، یان (پارەکـەم بـە شیلان داوە)، بەڵام لە ئاستی ئامرازی (ە)دا ئەم دووفاقیە ناچەسپێت و هەر دەگوترێت: (پارەکەم داوەتـە شیلان).

**سەرچاوە:**

- د. شێركۆ بابان، سەرجەم ئیشەكانی خۆمان لە سەر ئامرازی (ـە).

- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەكی ڕێزمانی كوردی، كۆڕی زانیاری كورد، بەغداد ١٩٧٦.

- د. وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەكی تر لە زمانەوانی، بەشی (پاشبەندەكان)، ل (٣٨-٤٥)، هەولێر ٢٠٠٤.

- د. وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەكی تر لە زمانەوانی، بەشی (یاسایەكی فۆنۆلۆژی)، ل (١٣٨-١٤١). هەولێر ٢٠٠٤.

- نووری عەلی ئەمین، دەوری بزوێنی (ـە) لە زمانی كوردیدا، گۆڤاری (ڕۆشەنبیری نوێ)، ژمارە (١١)، بەغدا ١٩٨٦.

# بابەتی هەفتەم

## ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە چەند ئاڵۆزییەکی ڕێزمانیدا[8]

۱/۷: دەسپێك:

ڕۆڵی ئامرازی (ـە) لە ڕێزمانی کوردیدا زۆر لە ئەوە گرینگتر و ڕەنگینترە، کە بە (نووسین)ێك، یان بە چەند بەسەرکردنەوەیەك یەکلایی بکرێتەوە. لە لایەنی ئێمەوە، ئێمە هەر لە سەرەتاوە، ئەم ئامرازەمان کردوە بە نیشانەیەکی پرسیار و لە بەر چاوی خۆمان دامان ناوە. هەر لەبەر ئەوە، لە ئاخاوتنی خەڵکی و لە خوێندنەوەی دەقە نووسراوەکان کەڵکمان وەرگرتوە و ڕۆژ بە ڕۆژ بە پەیژەی ڕێزمانەکەیدا سەر کەوتووین و ئێستایش هەر بەردەوامین لە سەر کەوتن. ئەوەیش لە یاد نەکەین کە ڕێزمانی ئامرازی (ـە) بریتیە لە گەمەیەکی زۆر زۆر هورد و ئاڵۆز، بەڵام بە تەواوی سفت و خنج و بنەمادارە. زاراوەی (سفت) واتای ئەوە دەگەیەنێت کە لە ریزێکی ڕێك و پێکدایە و خانەی ئەندازیاریانەی خۆی هەیە و ئەگەر لە جێی خۆیدا نەبێت، بە سفتی داناخەوێتە نێو ڕێزمانەکەی. زاراوەی (خنج) بە واتای ئەوە هاتوە، کە هەل و مەرجەکەی زۆر وردە و ڕوخسارەکەی لە یەك بزوێنی نەگۆڕ (ـە) پێك هاتوە و زۆر جار لە ریزی ئاخاوتندا وندا دەبێت. زاراوەی (بنەمادار)یش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕێزمانی ئامرازی (ـە) نارێکی پەسند ناکات. واتە، ڕێزمانەکەی تەواوە و ئەوەی لە بەر چاوی ئێمە بە (نارێك) و بە (ناتەواو) دەبینرێت، ئەوا هێشتا لێی تێ نەگەیشتوون و پەلە دەکەین لە بڕیارداندا.

لە دووتوێی ئەم نووسینەدا، جارێکی تر و بە شێوەیەکی کاریگەرتر و بە بۆچوونێکی وردتر، ڕوو دەکەین لە ئەو ڕووبەرانەی کە (گێژەن)ێکی ڕێزمانی ئاڵۆزیان دەکات. لە گەڵ ئەوەیشدا، دەزانین کە ئەمە کۆتایی ڕێگاکە نیە، بەڵام بریتیە لە چەند هەنگاوێکی هورد و کاریگەر بەرەو ڕێزمانی ئامرازی (ـە).

---

[8] گۆڤاری (پەروەردە و فێرکردن)، ژمارە (۲)، ساڵی ۲۰۰۹

### ٢/٧: ڕوخسار و ئەرکی ئامرازی (ـە):

لە ڕووی ڕوخسارەوە، ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە یەك (بزوێن) پێکهاتوە و ئـەو بزوێنەیش سادەیە و هیچ دەنگێکی (خپ) هەڵ ناگرێت. کەواتە، ئەگەر دەنگێکی (نامۆ) کەوتە نێو ئەو ڕیزەوە کە ئامرازی (ـە)ی تێدا هەیە، ئەوا ئەو دەنگە نامۆیە دەگەڕێتەوە بۆ جێیەکی تر، هەرچەند کە ئامرازی (ـە) بووبێت بە هۆی دەرخستنی. هەر بۆ نموونە، دەگوترێت:

نامەکە کەوتوەتـ ـە سەر زەوی

لەئەم ڕستەیەدا، دەنگی /ت/ نامۆیە لە ڕیزەکـەدا و لـە هـەمان کاتـدا بـە هـۆی ئـامرازی (ـە)وە هاتوەتە نێو ڕیزەکە. لە ڕاستیدا، ئەو دەنگـە نامۆیـە /ت/ بریتیـە لـە دەنگێکی (خپ) لە قەوارەی مۆرفیمی ئێستاییدا، وەك: (نامەکە کەوتوت). لـە جـۆرە هەڵوەـەرجی ئاوهادا، سەری بزوێنی (ـە) لە کلکی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) خشاوە و ئەو دەنگە خپەی زیندوو کردوەتەوە و بە بڕگەی (تـ ـە) دەری خستوە. کەواتە، ئامرازی پەیوەندی (ە) لە ڕووی ڕوخسارەوە سادەیە و ئەگەر بووبێتیش بە هۆی دەرخستنی دەنگێکی (نامۆ)، ئەوا ئـەو دەنگە هـی بڕگەیەکە کـە کەوتوەتـە پێشی. ئەمـە و لـە ڕووی ئەرکەوە، ئـامرازی پەیوەندی (ـە) باڵێکی نوێ پەیدا دەکات لە میکـانیزمی ڕووداوی کارەکـەدا. ئـەرکی ئـەو باڵەیش ئەوەیە کە ڕووداوی کارەکە بگوێزێتەوە بەرەو ئاوەڵکارێك، وەك:

پێنووسەکە کەوتـ ـە ژێر مێزەکە

لە ئەم ڕستەیەدا، چەند توخمێکی ڕێزمانی هەیە، وەك:

یەکەم: توخمی ئاراستەداری هەیە و باری ڕووداوی کەوتنەکەی دیاری کردوە.

دووەم: توخمی ڕاگوێزی تێدایە و ڕووداوی کاری (کەوتن) ڕاگوێز بوە بۆ (ژێر مێزەکە).

سێیەم: بە پێی ئەوەی گوترا، کاتێك کە وشەی (پێنووسەکە) کەوتوەتە بەر ڕووداوی کاری (کەوتن)، ڕاگواستنێکی (ئاراستەدار) هاتوە بە سەریدا و ئاوەڵکاری (ژێر) بریتیـە لـە دوا پێگەی ئەو ڕووداوە.

لەلایـەکی تـرەوە، سـەرەرای ئـەرکی (ڕاگواسـتن)ی ڕووداوی کارەکـە، زۆر جـار ئامرازی (ـە) دەبێـت بـە (واتـاگۆڕ)، بـە تایبـەتی لـە ئـەو بارانـەدا کـە دەکەوێتـە پـێش (ئاوەڵکارێکی ڕووت)، وەك (چوون ە سەر)، وەك دەگوترێـت: (بـۆت ناچێته سـەر)، یـان (دانـە نـاو)، وەك دەگوترێـت: (پۆلیسـەکان دزەکـان دایـە نـاو)، (دان ە بـەر)، وەك دەگوترێت: (شیلان ئیشەکەی داوەتە بەر). هەر بۆ نموونە، واتای چاوگی (چوونەسـەر) زۆر جیاوازە و گۆڕاوە لە بنجەکەی، کە بریتیە لە (چوونە سەر تشتێك).

### ٣/٧: ئامرازی (ـە) و هەل و مەرجەکانی:

ئامرازی (ـە)، کاتێك کە بریتیبێـت لـە ئـامرازی پەیوەنـدی، ئـەوا لـە قـەوارەی (کار)ێکدایە و لە ئەو قەوارەیەدا ئەرکی ڕاگوێزتنێکی ئاراستەدار جێ بە جێ دەکات. بە واتایەکی تر، ئامرازی (ـە) هەر لە قەوارەی (کار)دا هەیە، نەك لە قەوارەی (ناو)دا، یان لە قەوارەی (ئاوەڵناو) و (ئـاوەڵگوزارە)دا. لـە گـەڵ گشـت ئەوانەیشـدا، ئـەم ئـامرازە هـەل و مەرجی خۆی هەیە و ئەو هەل و مەرجە بە سەر قەوارەی (کار) دەچەسپێت، وەك:

یەکەم: گشت کاتێك ئامرازی (ـە) دەکەوێتـە دوای کار، نەك پێشی کار، وەك:

نێمە چووین (ـە) ناو ئاوەکە

لە ئەم نموونەیەدا، ناتوانین ئامرازی (ـە) بگوێزینەوە بۆ پێش کاری (چوون)، مەگەر بە (بزرکاندن).

دووەم: ئامرازی (ـە) بریتیە لە پردی پەیوەندی لە نێو ڕووداوی (کار)ەکە و (ئاوەڵکارێکی شوێن)دا. لە نموونەکەی پێشوودا، ئامرازی (ـە) پردێکی دروست کردوە لە نێوان ڕووداوی کاری (چوون) و ئاوەڵکاری (نـاو)دا. کەواتـە، هـەبوونی (ئاوەڵکـارێکی شـوێن) بریتیـە لـە (بەردی بناغە) لە قەوارەی ئامرازی (ـە)دا و لە ئارایشت و تانوپۆی ڕستەی ڕێزمانیدا.

سێیەم: وەك ئامرازی (ـە) پردێك دروست دەكات لە نێوان ڕووداوی (كار) و (ئاوەڵكارێكی شوێن)دا، لە سەر ئەو پردی پەیوەندیە، ڕاگواستنێكی (تاك ئاراستە) هەیە و ڕووداوی كارە یەك ئاراستە دەگرێت، كە لە سەر ئاوەڵكارەكە تەواو دەبێت.

چوارەم: وەك ئامرازی (ـە) چوە سەر قەوارەی كارێك، ئەوا بۆی هەیە بچێتە سەر گشت ڕێژەكانی، تەنانەت دەچێتە سەر ئەو چاوگەی كە دەبێت بە كۆكەرەوەی گشت ڕێـژەكان، وەك:

چوون (ـە) ناو ....، چوون (ـە) ژێر ....،

چوون (ـە) بەر ....، چوون (ـە) سەر ...

یان، دەشێت ئاوەڵكارەكە بگۆڕین بە (ناوی ئاوەڵكاو)، وەك:

چوون (ـە) ناوەوە، چوون (ـە) ژێرەوە،

چوون (ـە) بەرەوە، چوون (ـە) سەرەوە

لە هەمان كاتدا، دەشێت ئاوەڵكارەكە بەراستەوخۆیی تەواو بكەین، وەك:

چوون (ـە) ناو ئاو، چوون (ـە) ژێر ئاو،

چوون (ـە) بەر كار، چوون (ـە) سەر كورسی

### ٤/٧: ئامرازی (ـە) بە پەنامەكی:

زۆر جار ئـامرازی (ــە) دەكەوێتـە نێـو ڕیـزەوە و بـە دیاردەیـەكی دەنگسـازیانە دادەپۆشرێت. ئەم داپۆشینەیش تەنها هەر ڕوخسارەكەی دەگرێتەوە، ئەگەرنا، واتاكەی لە ڕیزەكەدا هەر بە بەرجەستەیی دەمێنێتەوە و كاریگەری خۆی دەردەخات، وەك:

پێنووسەکە بخە سەر مێزەکە

پێنووسەکە کەوتەوە ژێر مێزەکە

بە پێی ڕێسای ئامرازی (ـە)، کە بریتیە لە ریزبوونی ئەم ڕەگەزانە:

(کار)، پاشان، (ئامرازی [redacted])، پاشان، (ئاوەڵکار)

دەشێت ئامرازی (ـە) لـە ریزەکـەدا بێـت، چـونکە ئاوەڵکـاری (سـەر) و (ژێـر) بـە ڕیـزە کەوتوونەتە پاش کارەکانی (خستن) و (کەوتن). لە هەمان کاتدا، واتادانـەوەی هـەبوونی ئامرازی (ـە) زۆر بە جوانی هەستی پێ دەکرێت لە پەرێزی هەر دوو کارەکەدا. سەبارەت بە سەلماندنی ئەو ڕاستیە، دەتوانین ڕستەکان بە چەشنێك هەڵ بسووڕێنین کە ئامرازەکە دەربکەوێت، وەك:

یەکەم: لەرستەی یەکەمدا، ئامرازی (ـە) تێکەڵ بوە بە جێناوی فەرمانی ڕاستەوخۆ (ـە) بۆ کەسی دوەمی تاك. ئەم جێناوەیش دەنگێکی (خپ) هەڵ دەگرێت لە چەشنی /ر/، واتە لە ڕەسەندا بریتی یە لە (ـەر)، وەك:

پێنووسەکە بخـ (ـەر)[redacted] سەر مێزەکە

ئەمە و ئەگەر خۆ لە گێلی نەدەین و ڕێچکەی زمـانی نووسـینی ڕێزمانـدار بـەر نەدەین، ئەوا دەبێت دەنگی خپی /ر/ ونـدا نـەکەین و نەهێڵین ئامرازی (ـە) دابپۆشرێت. بێگومان، لە جۆرە کـردەوەی ئاوهـادا، دوو کـەڵکی کاریگـەر هـەن، یەکـەمیان بریتیـە لـە دۆزینەوەی دەنگی خپی /ر/، لە جێناوی فەرمانی ڕاستەوخۆدا. کەڵکی دوەمیش بـریتیە لە دەرخستنی جێناوەکە لە (وندابوون) لە ریزی ڕەگەزە ڕێزمانیەکاندا.

دووەم: لە رستەی دووەمدا، کە بریتیە لە (پێنووسەکە کەوتەوە ژێر مێزەکە)، ئامرازی (ـە) ئاوێتە بوە لە گەڵ بزوێنی (ـە)، کە بریتیە لە دەنگی سێیەم لە پاشگری دووپاتی (ەوە)دا. لە ئەم هەل و مەرجەدا، ڕێزمانەکە ڕێ نادات و هیچ پرۆسەیەکی ڕێزمانی ئاوها نیە کە بتوانێت ئامرازی (ـە) جودا بکاتەوە لە پاشگری (ەوە). هەر لەبەر ئەوە، دەشێت پاشگری دووپاتی (ەوە) لاببەین و واتای رستەکە بگۆڕین، تا بە چاوی خۆمان ئامرازەکە ببینین لە ریزەکەدا، وەك:

پێنووسەکە کەوتـە ژێر مێزەکە

### ٥/٧: هەل و مەرجەکانی خستنەبڕی:

لـە گشت نووسـینەکاندا، هـەوڵمان داوە کـە نـەهێڵین ئـامرازی پەیوەنـدی (ــە) بخرێتە بڕی ئامرازی تر. زۆر جاریش نەمان هێشتوە، کە لە دەقی نووسینەکانیشدا، ئەو جۆرە پەرپووتیە دەر بکەوێت، بەڵام بە هۆی چاپکردنەوە و بە هەڵەی کەسـانی تـرەوە، رەنگە ئەو دیاردەیـە رووی دابێـت. لـە ئێرەیشـدا، دەمانـەوێت جـارێکی تـر کێشـەکە بـە جۆرێکی تر گەمارۆ بدەینەوە و ئەو هەل و مەرجانە دیاری بکەین کە دیاردەی خستنە بەری تێدا روودەدات:

یەکەم: وەك لە گشت نووسینەکاندا گوتوومانە، ئامرازی پەیوەندی (ـە) تەنها و تەنها هەر لە (قەوارەی کار)دا هەیە، ناشێت و نابێت لە قەوارەی ئاوەڵگوزارەدا، یان لە قەوارەی ناودا، هەبێت. واتە، ئامرازی (ـە)، ئەگەر بە (نارێزمان) بخرێتە جێیەك، ئەوا دەخرێتـە جێـی ئەو ئامرازانەی کە لە قەوارەی کاردان، نەك لە قەوارەی بابەتەکانی تردا.

دووەم: ئەگەر بیر بکۆشین لە ئاستی خاڵی یەکەم، تێ دەگەین کە دیاردەی (خستنەبڕی) لە ئامرازی (ـە)دا، تەنها لە ئەو کارانەدا هەیە کە (ئامرازدار)ن. کەواتە، وەك ئامرازی (ـە) لە قـەوارەی کاردایـە، دەشـێت بچێتە جێـی ئـەو ئامرازانـەی کـە ئـەرکی چێکردنی کـاری (ئامرازدار)یان هەیە.

سێیەم: بە پێی ئەو دوو خاڵەی پێشەوە، دەشێت ئامرازی (ـە) وەك (ئەندازە) بەکار بهێنین بۆ دانانی (هێڵی سوور)، لە نێوان دوو جۆر لە ئامرازی پەیوەندی. یەکەم جۆر بریتیە لە ئەو ئامرازانەی کە لە (قەوارەی کار)دان و کاری (ئامرازدار)یان چێکردووە و دووەم جۆر بریتیە لە ئەو ئامرازانەی کە لە (قەوارەی ئاوەڵگوزارە)دان و لە قەوارەی (کار)دا نین.

چوارەم: ئامرازی پەیوەندی (بە) لە بەر ئەوەی بە توخمی (گواستنەوە) و (ئاوەڵکار)ەوە ئاڵوودە و ئاوێتەیە، دەشێت بە شێوازێکی ئاسانتر بگۆڕدرێت بە ئامرازی (ـە).

تۆ گەیشتیت بە هەولێر: تۆ گەیشتیتـە هەولێر
تۆ گەیشتیت بە شیلان : تۆ گەیشتیتـە شیلان

بەسەرنجێکی ورد و زرنگ، دەتوانین (ئاوەڵکار)یش ریز بکەین، وەك:

تۆ گەیشتیتـە هەولێر : تۆ گەیشتیتـە نێو هەولێر
تۆ گەیشتیتـــە شیلان : تۆ گەیشتیتـە لای شیلان

پێنجەم: بە پێی ئەوەی گوترا، تەنها هەر ئامرازەکانی (کاری ئامرازدار) دەتوانن ببن بە ئامرازی (ـە). لە ئەم ڕووەوە، دەتوانین ڕوو بکەین لە چەند جۆرێکی تر لە ئامرازی (بە) کە بە هیچ جۆرێك ناشێت و نابێت بگۆڕدرێن بە ئامرازی (ـە)، وەك:

١. ئاوەڵگوزارەی دەستەبەرەی ڕووداو:
شیلان (بە دەست) ئیش دەکات
٢. ئاوەڵگوزارەی شێوازگری ڕووداو:
شیلان (بە جوانی) ئیشەکەی کرد

٣- ئاوەڵگوزارەی نرخ و بایی:

شیلان (بە دوو دینار) کراسەکەی فرۆشت

٤- ئامرازی تێپەڕاندن (دووجار تێپەڕ):

من ئەو کراسەم (بە شیلان) کڕی

٥- تێپەڕاندن بە کاری (دان):

من ئەو کراسەم (بە کردن) داوە

بێگومان لە ئەو نموونانەدا، ئامرازی (بە) لە چەند بابەتێکدا دەرکەوتوە و ئەو بابەتانە بە هیچ جۆرێك لە (قەوارەی کار)دا نین. هەر لە بەر ئەوەیە کە ناتوانین هیچ ئامرازێك لە ئەو نموونانە بگۆڕین بە ئامرازی (ـە). بە واتایەکی تر، ئەو ئامرازانەی سەرەوە، ئەو توخمانە هەڵناگرن کە لە ئامرازی (ـە)دا هەیە، وەك (توخمی گواستنەوە، توخمی ئاراستە، توخمی ئاوەڵکار). بەڵام لە نموونەیەکدا، وەك:

کراسەکەم دا بە شیلان : کراسەکەم دایـە شیلان

هەر سێ توخمەکە هەیە لە هەردوو ئامرازەکەدا. هەر لەبەر ئەوە، دیاردەی (خستنە بڕی) بە رادەیەکی باش رووی داوە.

شەشەم: لە ئاستی ئامرازی پەیوەندی (بۆ)، بابەتەکە نەختێك ئاڵۆزە، چونکە دوو توخمی تێدا هەیە لە چەشنی (توخمی گواستنەوە و توخمی ئاراستە). واتە، (توخمی ئاوەڵکار)ی تێدا نیە. لە نموونەیەك، وەك:

ناردی بۆ هەولێر : نارد یـە هەولێر

دەشێت وشەی (هەولێر) جێی ئاوەڵکارەکە بگرێتەوە. هەر لەبەر ئەوە، دەشێت ئامرازی (بۆ) بگۆڕین بۆ ئامرازی (ـە). لە نموونەیەکی تردا، وەك: (تۆ ناردت بۆ شیلان)، ناتوانین ئامرازی (ـە) بخەینە بری ئامرازی (بۆ) چونکە وشەی (شیلان) توخمی ئاوەڵکاری تێدا نیە. هەر بۆ نموونە، دەشێت (ئاوەڵکار)ێك بکەینە سەربار، وەك: تۆ ناردتـ لە سەر شیلان). لە ئێرەدا، دەبینین کە ئاوەڵکاری (سەر) کێشەکەی چارەسەر کردوە. هەر لە بەر ئەوە، دەتوانیین بڵێین: پرۆسەی (خستنەبەری) لە نێوان ئامرازی (بۆ) و ئامرازی (ـە)دا بە (خوار و خێچی) و بە (لەنگی) پیادە دەکرێت، چونکە هەردوو ئامرازەکە جیاوازن لە یەکتری لە (توخمە واتاییەکان)دا. بە کورتی و بە کوردی، دیاردەی خستنە بڕی، ئەگەر هەبێت، لە ئاستی (کاری ئامراز)دا هەیە و ئەو دیاردەیە لە نێو (قەوارەی کار)دایە، نەك هیچ قەوارەیەکی تر. لەگەڵ ئەوەیشدا، خستنە بڕی تەواو کاتێك بە تەواوی ڕوو دەدات کە توخمە واتاییەکانی هەر دوو ئامرازەکە بە سفتی و بە هوردی بەرانبەر بە یەکتری هاوسەنگ بوەستن.

٦/٧: پوختەکاری:

- ئامرازی پەیوەندی ڕوخسارێکی پەتی و سادەی هەیە و بە تەنها لە بزوێنی (ـە) پێك هاتوە. واتە، ئامرازی (ـە) هیچ دەنگێکی خپ (silent) لە ناخی خۆیدا هەڵناگرێت.
- ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە پەرێزی (ڕێزمانی کار)دایە و لە هەرجێییەکی تردا دەربکەوێت، ئەوا بە هەڵە لێکدراوەتەوە.
- ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە نووکەوە دەلکێت بە دوا کۆلکەی کارەوە و لە کلکەوە بارگەیەك هەڵ دەگرێت، لە چەشنی (ئاوەڵکار).
- بە پێی خاڵی پێشوو، ئامرازی (ـە) دەبێت بە (گونجێنەر) بۆ گواستنەوە (ڕووداوی کار) بۆ سەر ئاوەڵکاری شوێن.

- زۆر جار ئامرازی (ـە) ونـدا دەبێـت لـە (شـەڕەبزوێن)دا، بـەڵام دەبێـت چـاوی ڕێزمانی بی دۆزێتەوە.
- ناڕێکترین کردەوە لە ئاستی ئامرازی پەیوەندی (ـە) بریتیـە لـە (خستنەبەری) ئەم ئامرازە لە جێی ئامرازەکانی تر. بێگومان، نزیکترین ئامرازی پەیوەندی لە ئامرازی (ـە) بریتیە لـە ئـامرازی (بـە)، بەتایبـەتی لـە ئـەو بەکارهێنانـەدا کـە (ئاراستەداری) دیاری دەکات.
- ئێمە بە هیچ جۆرێك لەگـەڵ ئـەو کردەوەیـەدا نـین کـە پـەرێزی ئـامرازی (ـە) تێکەڵ و پێکەڵ بکرێت لەگەڵ ئامرازەکانی تر، چونکە هـەر ئامرازێـك ئـەرك و بەکارهێنانی خۆی هەیە.

سەرچاوە:


- د. شێرکۆ بابان، هەندێك لە نووسینە بڵاوکراوەکانی خۆمان لەمـەڕ (ئـامرازی پەیوەندی).
- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کـورد، بەغدا ١٩٧٦.
- نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی ١٩٦٠.

# بابەتی هەشتەم

## ئامرازی پەیوەندی (ە) وەك پاشگر لە کاری ناسادەدا[٩]

لە ڕێزمانی کوردیدا، ئامرازی پەیوەندی (ـە) ماکی خۆی هەیە و مۆرکی خۆی هەیە و زۆر ئەستەم و دژوارە کە نموونەکانی ئەم ئامرازە بە سفتی وەربگێڕدرێت بۆ سەر زمانێکی تر. هۆی ئەم راستیەیش ئەوەیە کە ئەم ئامرازە ئەدگاری (راگوێزتن) هەڵ دەگرێت و ڕووداوی کار بە ڕاستەوخۆیی دەباتەسەر ئاوەڵکارێك. لەلایەکی ترەوە، ئەم کەرەستە گرنگە هەر لە بەشە ئاخاوتنی (کار)دا چالاکی دەنوێنێت.

### ١/٨: جێگای ئامرازی پەیوەندی:

لە ئەو ئیشانەدا کە ئێمە ئەنجامی‌مان داوە لە سەر روخسار و فۆرمی (پلیکانەی رستە)، دوو خانە تەرخانکراوە بۆ جێگەی ئامرازی پەیوەندی، وەك:

خانەی یەکەم: خانەی (+ ٤) کە دەکەوێتە پێش رەگی کار، لە نێوان خانەی بەرکار (+ ٥) و خانەی پێشگری واتاگۆڕ (+ ٣)، بۆ نموونە، دەگوترێت:

| (+ ٥) | [redacted] | (+ ٢) | (سفر) |
|---|---|---|---|
| هیچ | [redacted] تۆ | نا | لێم |

خانەی دوەم: خانەی (- ٩) کە بە تەواوی دەکەوێتە پاش (رەگی کار) و لە پاش پاشگری دووپاتی (موە)، کە لە خانەی (- ٨)دا ئاکنجیە، وەك:

| (+ ٥) بەرکار | (سفر) کار | ( ٨ ) | [redacted] |
|---|---|---|---|
| نامەکە (م) | دابوو | دوە | [redacted] تۆ |

---

٩ گۆڤاری (زمانناسی)، ژمارە (١/ ٢٠٠٩).

بە واتایەکی تر، هەر کاتێك کە ئامرازی پەیوەندی لە خانەی (+ ٤) دەترازێت، دەبێت بە دوا پاشکۆی کار و لە دوای ئەو خانەیە (- ٩) خانەیەکی تر نامێنێت کە بتوانێت روخساری (کار) یان (رستە) درێژ بکاتەوە. سەبارەت بە بەراوردی ئەو دوو خانەیە، هەندێك سەرنج هەن و دەشێت تۆمار بکرێن، وەك:

یەکەم: لە پلیکانەی رستەدا، ئامرازی پەیوەندی لە دوو خانەدا دادەساکێت. خانەیەکیان دەکەوێتە پێش (کار)ەکە و ریزبەندی چوارەم داگیر دەکات و لەخانەی (+ ٤)دا، دادەنیشێت. خانەکەی تر دەکەوێتە پاش (کار) و لە ریزبەندی نۆیەمدا دادەنیشێت و ئەم خانەیە بریتیە لە (- ٩). بێگومان، هێمای کۆ (+) بەکارهێنراوە بۆ ئەو خانانەی کە دەکەوێتە لای راست (پێش کار) و هێمای کەم (-) بەکارهێنراوە بۆ ئەو خانانەی کە دەکەوێتە پاش (بنجی کار)، واتە خانەکانی لای چەپ. بۆ خوێنەری ئازیز رەنگە زەحمەت بێت ژمارەی خانەکان لە بەر بکات، بەڵام دەتوانێت بە هێمای کۆ (+) و کەم (-)، (پێشکار) و (پاشکار)ی (بنجی کار) دیاری بکات. بێگومان، لە گشت نیشەکانی ئێمەدا خانەی (بنجی کار)، کە بریتیە لە بناغەی (کار) لە (رستە)دا، بە ژمارە (سفر) دانراوە، وەك لە سەر نەخشەی (١/٨) دەستنیشانکراوە.

| ئەو کۆلکانەی دەکەونە پێش کار | | | | | | خانەی (سفر) بنجی کار | ئەو کۆلکانەی دەکەونە پاش کار | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٥ + | ٤ + | ٣ + | ٢ + | ١ + | | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ... |
| سنووری رستە | | | | | | | | | | | | | |

نەخشەی (١/٨): خانەی (بنجی کار) لە پلیکانەی رستەدا

دووەم: هەرسێ ئامرازی پەیوەندی (لە، بە، بۆ) و هاوڕێکانیان بۆیان هەیە بکەونە پێش کار و لە خانەی (+ ٤)دا دابنیشن. یان، دەتوانن بکەونە پاش کار و لە خانەی (- ٩)دا دابساکێن، وەك:

| لە پێش ڕەگی کار | لە پاش ڕەگی کار |
|---|---|
| من (بەتۆ) گەیشتم | من (...) گەیشتم (بەتۆ) |
| من (بۆ تۆ) دەنووسم | من (...) دەنووسم (بۆ تۆ) |
| من (لە تۆ) دەپرسم | من (...) دەپرسم (لە تۆ) |

بە سەرنجێکی ورد دەردەکەوێت کە ئامرازەکان بازیان داوە بە سەر کارەکەدا. بەرانبەر بە ئەم دیاردەیە، ئەم دووبارییەی کە لە ئاستی ئامرازەکانی (بە، لە، بۆ) و هاوڕێکانیاندا هەیە، ئامرازێکی تر هەیە کە هەر لە خانەی (- ٩)دا چەسپ دەبێت و نە (پاشەکشێ) و نە (پێشەکشێ) دەکات. ئەو ئامرازە بریتیە لە (ـە)، کە دەلکێت بەکلکی کارەوە و بەری نادات، وەك:

من گەیشتمـ (ە تۆ)

من نامەکەم دابوو (ە ئەو)

یان، دەلکێت بە کلکی چاوگەوە، کە بریتیە لە (نوونی چاوگ)، وەك:

گەیشتنە ئامانج، دانە دەست

لە ڕاستیدا، وابەستەبوونی ئامرازی (ـە) بە خانەی (- ٩)وە، بێ مەلامەت نیە و دەشێت ڕەگ و ڕەگێشەی ئەو خزمایەتیە بدۆزینەوە، تا بکرێت بە (پێوەر) بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو دووبارییەی کە ئامرازەکانی تر پیشانی دەدەن. هەر لەبەر ئەو هۆیە، لە خاڵەکانی داهاتوودا ئەدگارەکانی ئەو ئامرازە دەخەینە نێو چوارچێوە.

سێیەم: لەهەر جێیەکدا کە ئامرازەکانی تر (بە، لە، بۆ) بتوانن لابچن و ئامرازی (ـە) ببێت بە جێگرەوەیان، دیاردەی ئاراستەگری لە ئارادایە، وەك:

دام (بە) تۆ : دامـ (ـە) تۆ

ڕۆیشتم (بۆ) بازاڕ : ڕۆیشتمـ (ـە) بازاڕ

هەر بۆ نموونە، بۆ ڕستەکانی:

بردم (بۆ) تۆ

خواردم (بە) دەست

دام (لە) دیوارەکە

ناتوانین بڵێین(*):

بردم (ـە) تۆ(*)

خواردم (ـە) دەست(*)

دام (ـە) دیوارەکە(*)

کەواتە، ئەدگاری ڕاگوێزی و ئاراستەگری بریتیە لەئەو مەرجە بنەڕەتیەی کە دەشێت ئامرازی (ـە) بکات بە جێگرەوەی ئامرزای تر.

چوارەم: ئامرازی (ـە) تەنها و تەنها هەر لە پەرێزی کاردا هەیە و ڕووداوی ئەو کارە (ڕاگوێز) دەکات بە (ئاراستە)ی (ئاوەڵکار)ێك، وەك:

پۆلیسەکە دزەکەی دابوو(ە) پێش

لە ئەم گۆشە نیگایەوە، ئاوەڵکارەکانی (دەر، بەر، پێش، دوا، پاش،...) دەکەونە پاش ئامرازی (ـە). بە ئەم پێیە، ئامرازی (ـە) هەر لەپەرێزی کاردا هەیە و هەر لە پەرێزی کاردا ئەرکی (جێگرتنەوە)ی ئامرازەکانی تر دەنوێنێت. بەشێوازێکی زۆر هوردتر و زۆر سفت تر، لەئەو ڕووبەرە بەرتەسکەیشدا، هەر ئەو ئامرازانە هەڵ دەبژێرێت کە ئاکاری ئاراستەگری دەنوێنن.

پێنجەم: بەپێی ئەوەی گوترا، ئەو بارگەیەی کە بچێتە نێو خانەی ئامرازی (ـە)، کە بریتیە لە ( ٩) دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا هەبن:

مەرجی یەکەم: دەبێت ئامرازەکە لەپەرێزی (کار)دا بێت، نەك بەشە ئاخاوتنێکی تر.
مەرجی دووەم: ئەو ئامرازەی کە لە پەرێزی کاردایە، دەبێت ئەدگاری (ئاراستەگری) تێدا هەبێت:

شەشەم: بە پێی ئەو دوو مەرجەی سەرەوە، دەشێت ئامرازی (لە...) وەدەرنێین، چونکە لەپەرێزی کاردا هەیە، بەڵام ئەدگاری ئاراستەگری تێدا نیە. هەر بۆ پراوە، دەگوترێت:

وێنەکە (م) دا بوو (لە) دیوارەکە

وێنەکە (م) دابوو (بە) منداڵەکە

ئێستا ئەگەر ئامرازی (لە) و (بە) بکەین ئامرازی (ـە)، دەبینین کە ڕستەی یەکەم تێك دەچێت، چونکە ئەدگاری (ئاراستەگری) تێدا نیە، بەڵام نموونەی دووەم نابزرکێت، چونکە ئەو ئەدگارەی تێدا هەیە. بەواتایەکی ئەستوورتر، هەردوو کارە ئامرازدارەکە (دان لە...) و (دان بە...) دەچنەسەر یەك ڕێچکەی واتایی، کە بریتیە لە (دان بە...)، وەك:

وێنەکە (م) دابوو (ە) دیوارەکە(*)

وێنەکە (م) دابوو (ە) منداڵەکە

لە گۆشە نیگای ئەم حەشارگەیەوە، دەردەکەوێت کە ئامرازی (بە) لە کاری (دان)دا بریتیە لە باڵێکی تەواوکەر بۆ (ئاراستەگری)، بەڵام ئامرازی (لە) ئەو باڵە دروست ناکات.
هەفتەم: ئەو کارانەی کە بە ئەدگاری ئاراستەگرییەوە ئامرازەکانی (بە) و (بۆ) وەر دەگرن، لیستی تایبەتی خۆیان هەیە و دەشێت کۆیان بکەینەوە لە خشتەیەکدا، وەك:
ـ ئامرازی (بۆ):

ڕۆیشتن (بۆ...)، چوون (بۆ...)، بردن (بۆ...)

ناردن (بۆ...)، ڕوانین (بۆ...)، ...

- ئامرازی (بە):

گەیشتن (بە...)، دان (بە...)، گوتن (بە...)، ...

- ئامرازی (بە...دا):

دان (بە...دا)، کێشان (بە...دا)، ...

- ئامرازی (بە...ەوە):

دان (بە...ەوە)، نان (بە...ەوە)، چوون (بە...ەوە)

بە سەرنجێکی هورد لە ئەو نموونانە، دەبینین کە نموونەی ئامرازەکانی (بۆ، بە، بەـ دا) دەتوانن جێی (ئاوەڵکار)ێك بکەنەوە لە ئەو بۆشاییەدا کە دیاریکراوە، کەچی لە ئاستی ئامرازی (بە...ەوە) زێدەڕۆیی ڕووی داوە، چونکە ناتوانین (ئاوەڵکار)ێك بار بکەین. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە ئامرازی (بە...ەوە) ئاکاری ئاراستەگری تێدا نیە. هەشتەم: لەنموونەیەکدا، وەك:

دەچم (بۆ) هەولێر (بۆ) ئیش کردن

ئامرازی یەکەم (بۆ) دەشێت بکرێت بە (ـە)، چونکە کاری (چوون) ئاکاری ئاراستەگری تێدا هەیە، بەڵام بۆ ئامرازی دوەم ئاوەها نیە، چونکە ئامرازی (بۆ) لە ڕەسەندا بریتیە لە (لەبۆ)، بەواتای (لە بۆ مەبەستی ئیش کردن). هەر لەبەر ئەو هۆیە، هەردوو ئامرازی (بۆ) لە یەکتر جودا دەبنەوە، وەك:

دەچم (ـە) هەولێر (لەبۆ) ئیش کردن

کەواتە، دووجۆر لەئامرازی (بۆ) لەیەکتری جودا کرانەوە، وەك:

بۆ: ئامرازی ئاراستەگر

- بۆ: ئامرازی هۆکارگر

نۆیەم: ئەوەی سەیرە، ئامرازەکانی (بە، بۆ) ناتوانن لە سەر یەك بنکەی (کار) کۆ ببنەوە لەیەك نموونەدا، چونکە یەك رەگێشەی ڕێزمانی پێك دەهێنن. لە هەمان کاتدا، ئەگەر ئامرازی (ـە) هاتە کایەوە، ئەوا ئەو ئامرازانە (ئاودیو) دەبن، چونکە هەمان رەفتاری ڕێزمانیان هەیە لەگەڵ ئامرازی (ـە).

دەیەم: بەکۆی ئەو خاڵانەی پێشەوە، بەرەنجامێك دەکەوێتەکار. ئەو بەرەنجامە ئەوەیە کە دەشێت لە خانەکەی (+ ٩)دا، سەرەڕای ئامرازی (ـە)، جێی ئەو سێ ئامرازە بکەینەوە، کە لە پەرێزی کاردا رۆڵی (ئاراستەگری) دەگێڕن وەك: (بە...، بۆ...، بە...دا، ...). بە ئەم پێیە دەتوانین کێشەی (پێشکار) و (پاشکار) لە یەکتری جودا بکەینەوە، بە ئەم چەشنە:

- خانەی پێشکار (+ ٤)، بۆ گشت ئامرازەکانی پەیوەندی
- خانەی پاشکار (- ٩)، بۆ ئامرازی (ـە) و ئامرازی ئاراستەگر (بە، بۆ، بە...دا، ...)

لە ئەم هەڵوێستەدا، دەشێت بە (پۆلێنکردن) ئەو ئامرازانە جودا بکەینەوە کە دەشێت بخرێنە نێو خانەی پاشکار ( ٩). واتە، مەرج نیە بارگەی خانەی (- ٩) هەر ئەو بابەتانە بێت کە لە سەرەوە دیاریکراون.

یازدەیەم: لە ئاستی (چاوگ)دا، هەردوو ئامرازی (بە) و (لە) دەبن بە دیوی (پێ) و (لێ) و دەگەڕێنەوە، بۆ نێوخانەی (+ ٤)، وەك:

دان (بە...) : (پێ) دان (...)

دان (لە...) : (لێ) دان (...)

دوازدەیەم: لەخانەی ( ٩)دا، ئامرازی (ـە) دەتوانێت (ئاوەڵکار)ێك وەربگرێت:

چوون (ـە ناو)، گەیشتن (ـە ناو)، کەوتن (ـە ناو)

ئەم جۆرە دەستەواژەیە دەگۆڕێت بە (تێ) و دەکەوێتە پێش کارەکە (تێ چوون، تێ گەیشتن، تێ کەوتن،...).

سیازدەیەم: لەخانەی (- ٩)دا، ئامرازی (لە) بۆی هەیە ئاوەڵکاری تر وەربگرێت، وەك:

کەوتن (لە سەر)، کەوتن (لە ژێر)، کەوتن (لە پێش)،
کەوتن(لە پاش)، کەوتن(لە دوا)، ...

لە ئەم دەستەواژانەدا، ئامرازی (لە) دەگۆڕێت بە (وە) و لەگەڵ ئاوەڵکارەکە دەهێتە پێشەوە، وەك:

(وەسەر) کەوتن ← سەرکەوتن
(وەژێر) کەوتن ← ژێرکەوتن
(وەپێش) کەوتن ← پێش کەوتن
(وە پاش) کەوتن ← پاش کەوتن
(وە دوا) کەوتن ← دوا کەوتن

تەنانەت، لەگەڵ ئاوەڵکاو (بەر، دەر، لا) هەمان میکانیزم هەیە، وەك:

کەوتنە دەر ← وەدەرکەوتن ← دەرکەوتن
کەوتنە بەر ← وەبەرکەوتن ← بەرکەوتن
بردنە لا ← وەلابردن ← لابردن

بە ئەم پێیە، پێشگرە ئاوەڵکاریەکان لەچەشنی (سەر، ژێر، پێش، پاش، دوا، بەر، دەر، لا، ...) رەگێشەیان لە ڕێزمانی ئامرازی (لە)دایە و بە سووك کردنی ئامرازی (وە) بە سادەیی دەرکەوتوون.

چواردەیەم: بەپێی ئەوەی گوترا، ڕەگێشەی ئەو كارانە دەرخرا كە بە ئامرازی (ـە) كراون بە دوو كەرت. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو پەرێزە ڕێزمانیە دیاریكرا كە ئامرازی (ـە) گەمەی تێدا دەكات. هەر بۆ نموونە، هەركارێكی (لێكدراو بە ئاوەڵكار)، لە چەشنی (دەر، بەر، وەر، لا)، یان ئاوەڵكارەكانی هەردوو كاری جووت هێز (كەوتن: خستن)، كە بریتین لە (سەر، ژێر، پاش، پێش، دوا)، دەگەڕێتەوە بۆ ڕەسەنی ئامراز (ـە). ئەمە و ئەگەر ئەو كارانە بەئامرازی (وە)، وەك (وەسەركەوتن، وەدەرخستن، ...)، بنووسرابان دەشیا بە (كاری لێكدراو) بناسرێن، بەڵام وەك ئەو ئامرازەیان فڕێ داوە، دەشێت بە (كاری داڕێژراو) بناسرێن، چونكە ئاوەڵكارەكان بریتین لە وشەی ڕێزمانی و خشتەی دیاریكراوی خۆیان هەیە لە ڕێزمانی كوردیدا.

### ٢/٨: نموونەیەك لەشرۆڤەكاریدا:

لە ئەم نموونەیەدا، دەتوانین كاری (دەرخستن) وەربگرین. بێگومان، ئەم كارە، بە ئەم ڕوخسارەی ئێستایەوە، ڕۆژانە بەكاردەهێنرێت، بەڵام پێ دەچێت ڕەگێشەی بگەڕێتەوە سەر ئامرازی (ـە)، وەك:

دەرخستن ← خستن (ـە) دەر

لە پاشتردا، ئەو ئاوەڵكاری (دەر) گوێزراوەتەوە و ئامرازی (ـە) بوە بە (وە)، وەك:

خستن (ـە) دەر ← (وە) دەرخستن

لە هەنگاوێكی سەرووتردا، ئامرازی (وە) لابردراوە و ئاوەڵكارەكە بە ڕووتی ماوەتەوە، وەك:

(وە) دەرخستن ← (ـ) دەرخستن

لە رووی واتاوە، ئەم کارە واتای گۆڕاوە و بە ئەم چەشنەی دوایی لە زمانی کوردیدا کەوتوەتەبەر چالاکی ڕێزمانی. بە واتایەکی نەختێك لێلتر، هەر کارێکی ناسادە، کە بە ئاوەڵکار داڕێژرابێت، دەگەڕێنەوەسەر ئامرای (ـە).

**٣/٨: لەبەرەنجامدا:**

ئامرازەکانی پەیوەندی لەچەشنی (بە، لە، بۆ)، بۆیان هەیە بکەونە پێشی کار، یان پاشی کار، بەڵام ئامرازی (ـە) هەر دەکەوێتە پاش کار.

ئامرازی (ـە) هەر لە پەرێزی (کار)دا هەیە، بەڵام ئامرازەکانی تر لە بەشە ئاخاوتنی کار و بەشە ئاخاوتنی تردا هەن.

ئامرازی (ـە)، ئەگەر زۆری لێ بکرێت کە بکەوێتە پێش کار، ئەوا روخساری دەگۆڕێت بە (وە + ئاوەڵکار). بەڵام ئەم ئامرازە تازەیە ئاودیو بوە و هەر ئاوەڵکارەکە لە چەند کارێکدا ماوەتەوە.

ئاوەڵکاری (ناو) لە گەڵ ئامرازی (ـە) ئاوێتە بوە و روخسارێکی تازەی چێکردوە لە چەشنی (تێ).

پێ دەچێت کە ئامرازی (ـە) بریتی بێت لە ئەو پردەی کە رووداوی (کار) دەگەیەنێت بە پێگەی (ئاوەڵکار).

لە زمانانی تردا، هەندێك لە ئاوەڵکارەکان تێکتواوەن و ئاوەژوون بە ئامرازێکی نادیارەوە، بەڵام لە کوردیدا ئەو ئامرازانە دابڕاون لە ئاوەڵکار. بۆ نموونە ئاوەڵکاری (تحت، فوق) لە عەرەبیدا، پێویست نیە بە (ئامراز) لە بەکارهێناندا، کەچی لە کوردیدا ئامرازەکان دیارن لە بنیادی (دووپارچەیی) ئاوەڵناودا، وەك (لە ژێر، لە سەر)، یان (ـە ژێر، ـە سەر).

**سەرچاوە:**

- د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا، هەولێر ٢٠٠٩.

- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.

- د. وریا عومەر ئەمین. چەند ئاسۆیەکی تر لەزمانەوانیدا. پاشبەندەکان ل (٣٨ ـ ٤٥). یاسایەکی فۆنۆلۆژی، ل (١٣٨ ـ ١٤١). هەولێر ٢٠٠٤.

## بابەتی نۆیەم

## ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە چەند نموونەیەکی لێڵدا

بە ڕاستی، ئامرازی پەیوەندی (ـە) ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەیە لە زمانی کوردیدا، چونکە هەر لە ڕێزمانی (کار)دا ڕۆڵی هەیە و ڕووداوی کارەکە ڕاگوێز دەکات بۆ پێگەیەکی ئاوەڵکاریانە، وەك: (هاتنەدەر، چوونەسەر، دانەبەر، کەوتنەگەڕ، ...). لە دەروازەی پێنجەمی کتێبی (ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە زمانی نووسیندا[١٠])دا هەشت بابەت لە سەر ئەم ئەم کەرەستە ڕێزمانیە بڵاوکراوەتەوە. لە ئەم نووسینەیشدا، چەند لایەنێکی ئەم بابەتە مۆرکاوی و ناوازەیە ڕوون دەکەینەوە.

### ٩/١: نموونەیەکی ئاڵۆز:

لە نموونەی یەکدا، وەك: (دەچمەوە هەولێر)، چەند خاڵێکی ئاڵۆزی هەیە، وەك:

یەکەم: ئامرازی (ـە) لە ریزەکەدایە و چاوی بیر گێلەی لێ ناکات. هەر بۆ نموونە، دەشێت پاشگری دووپاتی (ەوە) لاببەین، تا بە چاوی ئاسایی فەرقی بکەین، وەك: (دەچمـە هەولێر). لە ئەم هەڵ و مەرجەدا، دیاردەی ونداوونی ئامرازی (ـە)، بە هۆی پاشگری دووپاتی (ەوە)، زۆر زەقە و گشت کەسێك لێی تێ دەگات، چونکە هۆیەکەی لە جۆری دەنگسازیە.

دووەم: وەك ئامرازی (ـە) لە ریزەکەدایە، دەشێت قەوارەکەی تەواو بکەین و ئاوەڵکارێکی بۆ ریز بکەین، وەك: (دەچمەوە نێو هەولێر)، یان، (دەچمـە نێو هەولێر). لە ئەم

[١٠] بڕوانە بۆ بەشەکانی (١١ ١٨) لە کتێبی (ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا/ هەولێر ٢٠٠٩ ).

کردەوەیـەدا، ڕێسـای دەرکـەوتنی ئـامرازی (ـە) چەسپاوە، وەك: {کـار| ئـامرازی (ـە)| ئاوەڵکار}. هەر لەبەر ئەو سەدەمە، ئامرازی (ـە) بە ئارایشتی ڕێزمانی خۆیەوە دەرکەوتوە و واتای ڕستەکەی ڕاست کردوەتەوە.

سێیەم: لە ئەو نموونەیەدا، کە لە ئەم کۆپلەیەدا بـەکارهێنراوە، دەشێت هـەر لـە خـۆوە ئامرازی (بۆ) ڕیز بکەین، وەك: (دەچمەوە بۆ هەولێر)، لە جیاتی (دەچمەوە هەولێر). لە ئەم ئاستەدا، دەبینین کە ڕستەی یەکەم زۆر بەشکۆتر و ڕێزمانیترە لـە دێـڕی زمـانی نووسیندا. لەلایەکی ترەوە، هۆی ئـەم دیاردەیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە: لـە یەکـەم هەنگاودا، ئامرازی (بۆ) بە نارێزمـان کـراوە بـە ئـامرازی (ـە). یـان، لـە دوەم هـەنگاودا، ئامرازی (ـە) وندا بوە لە ڕیزی پاشگری دووپاتیدا.

چوارەم: ئەگەر وەك کوردیزانێکی ڕەسەن و وەك ڕێزمانزانێکی بە بڕشت، سەرنج بدەین لە نموونەکەی سەرەتا، کە بریتیە لـە: (دەچـمەوە هـەولێر)، دەشێت دوو بـاری ڕاسـت و دروست دەربکەون. یەکەمیان بریتیە لە ئەو ڕسـتەیەی کـە لـە خـاڵی دوەمـدا سـەوداکرا (دەچمەوە نێو هەولێر)، کە دەگەڕێتەوە بـۆ سـەر چـاوگی (چوونـ|ـە|نێـو...). دوەمیـان بریتیە لە ئەو نموونەیەی کە لەخاڵی سێیەمدا سەوداکرا، کە ئامرازی (بۆ) لە ڕیزەکەدایە و گفـت و گـۆ هـەڵ ناگرێـت، وەك: (دەچـمەوە بـۆ هـەولێر) بێگومـان، ئـەم ڕسـتەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوگێکی تر، کە بریتیە لە چاوگی (چوون بۆ ...).

پێنجەم: کەواتە، کاری (چوون)، دیوێکی تری هەیە لە چەشنی (چوون بۆ ...) و لە هەمان کاتدا دیوێکی تری هەیە لەچەشنی (چوونـ/ـە + ناو). لە ئەم چاوگەی دوایشـدا، دەشـێت ئاوەڵکاری (ناو)، بگۆڕدرێت بە هی تر، وەك: (چوونـ ـە ناو، چوونـ ـە ژێر، چوونـ ـە ژوور، چوونـ ـە بن، چوونـ ـە سەر، چوونـ ـە لا، چوونـ ـە بەر، چوونـ ـەدەر، ....)

شەشەم: بەپێی ئەوەی کە لە خاڵەکانی سەرەوەدا گوترا: دەشێت ڕستەی لێلی (دەچمەوە هەولێر) بە دوو ڕێگای جیاواز ڕاست بکرێتەوە. لە ڕێگای یەکەمدا، دەشێت بی کەین بە: (دەچمەوە ناو هەولێر) بۆ پاراستنی واتای چاوگی (چوونە ناو...). دوەمیان بریتیە لە ڕاست کردنەوەی ڕستەکە بۆ: (دەچمەوە بۆ هەولێر) بۆ پاراستنی واتای چاوگی (چوون بۆ ...). کەواتە، لە ڕستەی (دەچمەوە نێو هەولێر)دا لە پەرێزی ئامرازی (ـە) داین و لە ڕستەی (دەچمەوە بۆ هەولێر) لە پەرێزی ئامرازی (بۆ) داین.

حەوتەم: دەشێت ڕۆژێك لە ڕۆژان، کە گوڵی ڕێزمانی کوردی ڕەسەن کەوتە نێو کتێبەکان، ئەو ڕاستیە بزانین کە ڕێزمانی ڕستە لە (کار)ەوە دەست پێ دەکات و ڕێزمانی کاریش لە (چاوگ)ەوە دەست پێ دەکات. هەر بۆ نموونە، لە ئاستی ئەم نموونەیەدا، دەشێت دەروازەکانی چاوگی (چوون) بدۆزینەوە، تا بتوانین لە چاوگی (چوون بۆ) و (چوونە ناو) بدوێین.

هەشتەم: کەواتە، لە نموونەکەی بەردەستدا (دەچمەوە هەولێر)، دوو دەستدرێژی کراوە، یەکەمیان ئامرازی (ـە) ئاوێتە بوە لە گەڵ بزوێنی کۆتایی لە پاشگری (ەوە)دا. ئەمەیان هۆیەکەی دەنگسازیە و ڕێپێدراوە، چونکە لە گشت نموونەیەکدا ئاوەهایە. دوەمیان ئەوەیە جێگەی شاری هەولێر خراوەتەوە جێی (ئاوەڵکار)ەکەی ئامرازی (ـە)، ئەمەیشیان پێ دەچێت کە ڕێپێدراو بێت، چونکە واتای ئامرازەکە پارێزراوە.

### ٢/٩: لە نهێنیەکانی ڕێزمانی کوردی:

یەکەم: وەك لە پێشەوە ڕوونکرایەوە، ئامرازی (ـە) لە هیچ جێیەکدا ڕەسەن نیە، مەگەر لە جێیەکدا کە ئاوەڵکارێکی شوێن هەبێت، وەك: (چوونە سەر، کەوتنە بەر، ...). زۆر جار، بە جۆرێك لە جۆرەکان، وشەیەکی تر دەخرێتە بری (ئاوەڵکار)ەکە، وەك: (چوونە شار، کەوتنە کار).

دووەم: ئامرازی (ـە) پاشپرتی (ەوە)ی هەیە.

چوە ناو (ئاو)ەوە،

یان چوە ناو(-)ەوە، چوە سەر(-)ەوە، چوە دەر(-)ەوە، چوە ژوور(-)ەوە،

چوە ژێر(-)ەوە، ...

لە ئەم ڕوانگەیەوە، پێ دەچێت کە لە ئەم دەستەواژانەوە، ناوی ئاوەڵکاری پەیدابووبێت، وەك:

ناو ەوە، سەر ەوە، دەر وە، بەر ەوە)، ژێر ەوە، ژوو ەوە

سێیەم: پاشپرتی (ەوە) لە ئامرازی (ـە)دا واتایەکی نوێ دەبەخشێت. بۆ نموونە، واتای (مێزەکە چوە دەرگاکەوە) جودایە لە واتای ڕستەی (چوو بە دەرگاکەوە)، چونکە ئامرازی (ـە – ەوە) ناتوانێت جێی ئامرازی (بە – ەوە) بگرێتەوە. لە ڕستەی یەکەمدا، مێزەکە چوەتە ناو دەرگاکە، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا پێوانەی پانی مێزەکە بەراودکراوە بە پانی دەرگاکەوە، کە پانترە.

چوارەم: ئامرازی (ـە – دا) بڕەوی نیە، چونکە پاشپرتی (دا) واتاکەی ناگۆڕێت و لە واتای ئامرازی (بـە - دا) جوای ناکاتەوە. بۆ نموونە، واتای ڕستەی ( کەوتە دەمـ دا) هاوسەنگە لە گەڵ واتای ڕستەی( کەوت بە دەمـ دا).

**٢/٩: ئامرازی ڕەسەن (ـە):**

لە زمانی نووسیندا، چەند بارێکی شیاو هەیە بۆ دەرکەوتنی ئامرازی (ـە) لە ئاخاوتندا، وەك:

یەکەم: باری ڕەسەن و ڕێزمانی: ئەگەر ئاوەڵکاری شوێن، یان (جێکەوت)، دەرکەوتبێت بە کلکی ئامرازی (ـە)وە، وەك (ـە سەر، ـە ناو، ـە دەر). یان، ئەگەر ڕێزمانەکە ڕێی دابێت کە وشەیەکی تر بخرێتە بری ئاوەڵکارەکە، ئەوا ئامرازەکە لە ڕێزمانی ڕەسەنی خۆیدایە، چونکە ناشێت بگۆڕدرێت بە ئامرازێکی دی.

دووەم: لە هەر جێیەکدا ئامرازی (ـە) بە رووتی، واتە بەبێ (ئاوەڵکار) و بەبێ پاشپرت بەکارهێنرابێت، ئەوا دوو باری شیاو هەیە:

ئامرازی ڕەسەن: ئاوەڵکارێك پەسەند دەکات و کلۆریەکەی لادەچێت، وەك: (کەوتـە زەوی)، کە دەشێت و دەبێت بکرێت بە (کەوتـە سەر زەوی).

- ئامرازی ناڕەسەن: ئاوەڵکار پەسند ناکات و دەگۆڕێت بە ئامرازێکی تر، وەك: (بەفرەکە دەبێتـە ناو)، کە دەشێت و دەبێت بکرێت بە (بەفرەکە دەبێت بە ناو).

سێیەم: ئەگەر ئامرازی (ـە) پاشپرتی (دا)ی هەبوو، بەبێ مشت و مڕ و گەنگەشە، دەشێت بی گەڕێنینەوە بۆ (بە ... دا). وەك: (چوو ە دەستدا)، کە دەبێت بە(چوو بە دەستدا).

چوارەم: لە هەر جێیەکدا کە ئامرازی (ـە) پاشپرتی (ەوە)ی دەرخست، ئەوا ئامرازەکە ڕەسەنە. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە لە گەڵ پاشپرتەکەی یەکسان نیـە بە (واتا) بە پاشپرتەکەی ئامرازی (بە)، یان (ـە + ەوە) یەکسان نابێت بە (بە + ەوە). بۆ

نموونە، واتای ڕستەی (دەچێتـە گیرفانـەوە) بە تەواوی جیاوازە لە واتای ڕستەی (دەچێت بە گیرفانـەوە).

پێنجەم: ناشێت و نابێت دوو جۆر لە پاشپرتی (ەوە) بە یەك چاو سەیر بکرێن، وەك: (دەچێتە گیرفانـەوە) و (دەچێتـە دەرەوە). لە نموونەی یەکەمدا، پاشگری (ەوە) پاشپرتکی یەکێك لە ئامرازەکانی پەیوەندیە، بەڵام لە نموونەی دووەمدا پاشگری (ەوە) مۆرفیمێکی (وشە ڕۆنەر)ە، چونکە لە ئاوەڵکاری (دەر)ەوە، ناوی (دەرەوە)ی چێکردوە، وەك: (سەر: سەرەوە، بەر: بەرەوە پێش: پێشەوە دوا: دواوە پاش: پاشەوە ناو: ناوەوە ژێر: ژێرەوە، ژوورەوە، ماڵەوە...).

شەشەم: ئامرازی پەیوەندی (ـە) هەر لە ڕێزمانی (کار)دا هەیە و دەکەوێتە پاش کار، بەڵام ئامرازەکانی دی (بە، بۆ، لە) لە دەرەوەی کاریشدا ڕۆڵیان هەیە و لە پێش و لە پاشی کاریش بۆیان هەیە دەربکەون.

**٤/٩: ئامرازی (ـە) وەك جێگرەوە:**

لە هەر سێ جۆرە ئامرازەکەدا (بە، بۆ، لە)، ئامرازی (ـە) بۆی هەیە کەم و زۆر لە هەندێك باردا جێیان بگرێتەوە:

گەیشت (بە) هەولێر ← گەیشت (ـە) هەولێر

ڕۆیشت (بۆ) هەولێر ← ڕۆیشت (ـە) هەولێر

ڕوانیم (لە) تابلۆکە ← ڕوانیم (ـە) تابلۆکە

بە سەرنجێکی ورد، لە هەرجێیەکدا کە ئامرازەکە ئاراستەداری هەڵ بگرێت بەرەو خاڵێك، ئەوا ئامرازی (ـە) بۆی هەیە کە جێی ئامرازەکانی (بە، بۆ، لە) بگرێتەوە

له ئاخاوتندا. له دژئاراستهدا، رستهی (نان دهخۆم به دهست) نابێت به: (نـان دهخـۆم له دهست*). یان رستهی (نان بکڕه (بۆ) خۆت) نابێت به: (نان بکڕه له خۆت*). هۆی ئهمـه له ئهوهدایه که له ههردوو رستهکهدا ههردوو ئامرازی (به) و (بۆ) ئاراستهدار نین.

**٥/٩: بهرهنجام له زمانی نووسیندا:**

سهبارهت به زمانی نووسین، چهند پێشنیارێك ههیه و دهشێت تۆمار بکرێن، وهك:

پهسهند نیه که (پاشپرت)ی ئامرازێکی پاشپرتدار بپهرێنرێت، وهك زۆر جار باز دهدرێت به سهر ههردوو پاشپرتی (دا) و (هوه)دا. به شێوهیهکی گشتی، پهسهندیش نیه که دهنگی (د) کلۆر بکرێت له پاشپرتی (دا).

پهسهند نیه له هیچ جێیهکدا، ئهگهر ئاراستهداریش ههبێت، ئامرازهکانی پهیوهندی (به، له، بۆ) به ئامرازی (ـه) ئاڵ و گۆڕ بکرێن، چونکه ئهم ئامرازه رێزمانی تایبهتی خۆی ههیه و ناشێت نابووت بکرێت.

ئامرازی (ـه) وهك ئاراستهداره دوو مهرجی ههیه له دهرکهوتندا، وهك:

مهرجی یهکهم: ههبوونی ئاوهڵکارێکی شوێن بۆ ئهوهی نووکهتیری ئاراستهکهی پێ بگات.

مهرجی دووهم: ئامرازی (ـه) ههر له رێزمانی (کار)دا برهوی ههیه و رووداوی کارهکه به راستهخۆیی راگوێز دهکات بۆ سهر پێگهیهکی ئاوهڵکاریانه.

لـه سـهر نهخشـهی داهـاتوو، برشـتی ئـامرازی پهیوهنـدی (ــه) دهر دهخـهین لـه راگوێزکردنی رووداوی کاری (چوون) بۆ سهر چهند پێگهیهکی ئاوهڵکاریانه. بێگومان، له ئهم نهخشهیهدا ئامرازهکه له رێزمانی رهسهنی خۆیـدا گـوزهراوه و هـیچ پێشـێلکاریهك پهسهند ناکات.

| چوون | ئامراز | ئاوەڵکار | بارگە (ناو) |
|---|---|---|---|
| چوو | ە | ژێر | ئاوەکە |
| چوو | ە | ناو | ئاوەکە |
| چوو | ە | بن | ئاوەکە |
| چوو | ە | پێش | مامۆستاکە |
| چوو | ە | تەنیشت | مامۆستاکە |
| چوو | ە | لای | مامۆستاکە |
| چوو | ە | کن | مامۆستاکە |
| چوو | ە | سەر | مامۆستاکە |
| چوو | ە | بەر | بارەکە |

بە تەریبی لە گەڵ کاری (چوون)دا، پێ دەچێت کە بڕشتی ئامرازی پەیوەندی (ـە) والا بێت لە ڕاگوێزکردنی ڕووداوی کارەکان بۆ سەر چەند پێگەیەکی ئاوەڵکاریانە، وەك لە ئەم نموونانەدا گوڵبژێرکراون:

(پەرژانە سەر، پڕدانە سەر، ترنجانە نێو، تکانە سەر، چەسپانە نێو، ڕژانە نێو، کەوتنە بەر، گەیشتنە سەر، هاتنـە سەر، هاتنە دەر، دابارینە سەر، خزینە ژێر، زاینـە نێو، فڕینە سەر، دانە پێش، نانە نێو، نانە ژێر، نانە سەر، هێنانـە سـەر، خستنە سـەر، گرتنەبـەر، هاوێشتنە سەر، بردنە پێش، کردنە سەر، ناردنە سەر، ڕوانینە نێو، ...).

لە هەندێك کاردا، بڕشتی ئامرازی پەیوەندی (ـە) دەگات بە پرۆسەی (واتاگۆڕکێ)، وەك: (چوونەسەر: تۆ ئەم ئیشەت بۆ ناچێتەسەر)، یان (دانەبەر: تۆ ئەم ئەرکەت بۆ نادرێتەبەر)، یان (بردنەسەر: تۆ ئەم پیلانەت بۆ نابرێتەسەر).

لە گشت نموونەکانی ئامرازی (ـە)دا، ئەو ڕیزبەندییەی خوارەوە دەپارێزرێت. لە تیۆری (پلیکانە ڕستە)دا، ئەو سێ گیرفانە (١، ٢، ٣) دەبن بە بارگەی خانەی (- ٩) کە دەکەوێتە پاش خانەی پاشگری دووپاتی (ەوە)، کە بریتیە لە خانەی (- ٨).

| سفر- کار | ١- ئامراز | ٢- ئاوەڵکار | ٣- بارگە (ناو) |
|---|---|---|---|
| چوو | ە | ناو | ئاوەکە |

**سەرچاوە:**

**کەڵکی ڕاستەوخۆ وەرگیراوە لە بابەتەکانی کتێبێکی خۆمان بە ناوی: (ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا)، هەولێر ٢٠٠٩.**

# کەرتی سێیەم

# ڕێزمانی پاشگری کار (ەوە)

لە گشت ئیشەکانی ئێمەدا، بزوێنی بەرایی پاشگری (ەوە) بریتی بوە لە ئەندازەیەکی بەکار و بلیمەت بۆ ساغکردنەوەی روخساری (مۆرفیمی ئێستایی). ئەمەیان لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە، خودی ڕێزمانی ئەم پاشگرە گرنگە هێندە ئەستوور و وشك بوو، بە هیچ جۆرێك بە ڕێزمانی زمانە خزمەتکراوەکان لێك نەدەدرایەوە. لە ساڵی (٢٠٠١)دا، کتێبێکمان بلاوکردەوە بە ناونیشانی (ڕێزمانی پاشگری دووپاتی/ ەوە)، بەلاّم لە ئەم پازدە ساڵەدا (٢٠٠١- ٢٠١٦)، ئەم بابەتە گرنگە هەر لە بەردەستدا بوە و هەر تیونێتیمان نەشکاوە لە گێژەنی ڕێزمانە مۆرکاویەکەی. لە گەڵ ئەوەیشدا، ئەم مۆرفیمە گشتگرە وەك لالەیەکی دەستی بەکارهێنراوە، چی لە جودا کردنەوەی ڕێزمانی (بوون و هەبوون)دا و چی لە ساغکردنەوەی فۆرمی فۆنەتیکی مۆرفیمی ئێستاییدا. لە سەرەتادا، وامان دەزانی کە ئەم پاشگرە رەسەنە هەر هی (دووپاتی)یە، بەلاّم ڕۆڵە واتاسازیەکەی زۆر زۆر ئەستوورتر و بەرینتر بوو لە واتای (دووپاتی). ئەمە و لە (پلیکانەی رستە)دا، ئەم مۆرفیمە لە خانەی {٨}دا ئاکنجی دەبێت و چەند ئاکارێکی واتایی جێ دەکاتەوە لە رووداوی کاردا، وەك:

دژ-واتایی بە دووپاتی: وەك: شیلان هات و رۆیشتەوە

واتاگۆڕکێ بە یەکپاتی: وەك: شیلان گرەوەکەی بردەوە

واتا-بووژاندنەوە بە یەکپاتی: وەك: ئاگرەکە کووژایەوە.

# بابەتی دەیەم

## پاشگری دووپات کردنەوە (ەوە) لە شیتەڵکاریدا[11]

**١/١٠: سەرەتایەك:**

پاشگری (ەوە) کە بە (پاشگری دووپات کردنەوە) ناسراوە، بریتیە لە ڕەگەزێکی ڕێزمانی زۆر زۆر گرنگ لە زمانەکەدا، چونکە چەند سیمایەکی ڕێزمانی هەڵ دەگرێت کە زۆر تایبەتی و ڕەسەنن. لە لایەکی ترەوە، لە ڕێزمانی لاساییدا زۆر بابەت دەبینین کە دەربارەی ئەم کەرەستەیە نووسراون، بەڵام ئەوانە هەر هەموویان ناتوانن تێنوێتی ئێمە بشکێنن. بۆ نموونە، مامۆستای خوالێخۆشبوو ڕەئووف ئەحمەد ئالانی کتێبێکی فراوانی لەسەر نووسیوە و بڵاوی کردووەوە[12]. یان، لە زۆر نووسینی تردا، کەم و زۆر، ڕێزماننووسان لەسەری دواون[13]. لە راستیدا، ئەم ڕەگەزە زۆر زۆر گرنگ تر و بەنرختر و سەنگینترە لە ئەوەی کە باسکراوە. هەر لەبەر ئەم هۆیە، ئێمە لە ساڵی ١٩٩٤دا کتێبێکمان لە سەری داناوە و لە ساڵانی پاشتردا پێداچوونەوەی پوختەترمان بۆ کردوەتەوە. بۆ زانین، ئەو کتێبە (ڕێزمانی پاشگری دووپاتی ەوە). لە ساڵی (٢٠٠١)دا، لە هەولێر، لە لایەن (دەزگاری موکریانی)ەوە بلاوکراوەتەوە. سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم نووسینە، ئێمە وا هەست دەکەین کە باری واتاسازی پاشگری (ەوە) زۆر گرنگە، بەڵام زۆر ئاڵۆزە. هەر لەبەر ئەوە، لە ئەم بابەتەی بەردەستدا چەند وردبوونەوەیەکی ڕێزمانی پێشکەش دەکەین، بۆ ئەوەی بە زوویی بگەین بە ئاستی واتای گشتی و واتای تایبەتی پاشگرەکە. پاشان، لە ئەم هەنگاوەوە دەتوانین بەرکوڵێکی پوختە پێشکەش بکەین لە سەر واتاسازی لە پاشگری (ەوە)دا[14]. لە راستیدا، ئەم نووسینە، خۆی لە خۆیدا، بریتیە لە نوخشانەی چەند

---

[11] گۆڤاری (مەتین) . ژمارە (٩٠). دهۆك ١٩٩٩.

[12] بڕوانە سەرچاوەی (٢).

[13] بڕوانە سەرچاوەی (٣، ٤، ٥، ٨).

[14] بڕوانە بۆ بابەبەتی داهاتوو

نووسینێکی تر لـە ڕێزمـانی ئـەم کەرەسـتەیەدا. بـە هیـواین، بتـوانین لـە (عمومیـات)ی زمانەوانی دەربچین و ڕوو بکەین لە ئاکارە تایبەتیەکانی زمانەکە، بەتایبەتی لە ڕێزمانی ئەم مۆرفیمە گرنگەدا[٥].

**٢/١٠: جۆرەکانی پاشگری (ەوە):**

بە هوردی و بە سفتی چوار جۆر ڕەگەزی ڕێزمانی هەن، کە بتوانن پاشگری (ەوە) هەڵ بگرن، وەك:

**یەکەم: پاشگری کار:**

ڕەگەزی (ەوە) وەك پاشگری دووپات کردنەوە لە گەڵ ئەو ڕێژە و ناوانـەی کـە لەسەر بنجی (کار)ێك ڕۆنراون، وەك: (بردنەوە : بردمـەوە : بردووتەتەوە).

**دوەم: پاشگری ئامرازی پەیوەندی:**

ڕوخساری (ەوە) وەك پاشپرتێك بۆ هەندێك لە ئامرازەکانی پەیوەندی، وەك:

لە هەولێرەوە هاتوە
بە نازەوە دانیشتوە
دەچێتـە نێو ئاوەکەوە

**سێیەم: پاشگری ناوی شوێن:**

پاشگری (ەوە) بۆ پەیداکردنی ناوی (شوێن). یان بۆ گۆڕینی ئاوەڵکاری شوێن بۆ (ناو)، وەك:

---

[٥] مەبەست لـە (عمومیـات) ئەوەیـە کـە هەنـدێك دیـاردە لـە هـەموو زمانەکانـدا هەیـە. لـە بەرانبـەردا، (ئاکـارە تایبـەتیەکان)ی زمانەکە هێشتا هەر بە باڵی تاریکی داپۆشـراون.

ژێر: ژێرەوە، سەر: سەرەوە، ناو: ناوەوە)،
دەر: دەرەوە، پشت: پشتەوە، پێش: پێشەوە

چوارەم: لە گەڵ وشەی (دیسان)، بە واتای (دووبارە)، وەك: (دیسان: دیسانەوە، هەمیسان : هەمیسانەوە، یان هەمدیسان : هەمدیسانەوە).

لە دەقی ئەم بابەتەدا، تەنها هەر جۆری یەکەم جێی مەبەستە و دەستەگوڵی ئێمەیە لە ئەو گەمەیەدا کە دەچەسپێت. بێگومان، لە ئەم جۆرەیشدا، کە بریتیە لە (پاشگری کار)، سێ ژێرجۆر هەیە بۆ سێ ڕێچکەی واتایی هەیە، وەك:

(١): پاشگری دژواتایی (ەوە)، وەك: (هات: هاتەوە)
(٢): پاشگری واتاگۆڕ (ەوە)، وەك: (بردن : بردنەوە)
(٣): پاشگری واتابەست (ەوە)، وەك: ( - : کووژانەوە)

بە واتایەکی تر، پاشگری (ەوە) یەك فۆرمی فۆنەتیکی هەیە، بەلآم سێ مۆرفیمی جیاواز دەبەخشێت بە ڕێزمانی کوردی. کەواتە، ناشێت و نابێت پاشگری (ەوە) بە یەك مۆرفیم بناسرێت، یان بە شێوەیەکی گشتی بە (پاشگری دووپاتی) بناسرێت، چونکە لە خاڵی (٢) و (٣) بە هیچ جۆرێك واتای (دووپاتی)، یان (دووبارەیی)، لە ئارادا نیە. بە کورتی، دەشێت ئەم ڕەگەزە ناوزەد بکەین بە (پاشگری ەوە)، بەس لە جێی خۆیدا نیە ناوزەدی بکەین بە (پاشگری دووپاتی ەوە). تەنانەت، تا ئێستا (٢٠١٦/٣/٤)، ئێمەیش هەر ئاوەها ناوی ئەم کەرەستەیەمان بردوە.

### ٣/١٠: گشتایەتی لە پاشگری (ەوە)دا:

بە شێوەیەکی گشتی، هەموو کاری زمانەکە دەتوانن ئەم پاشگرە پەسەند بکەن، تەنها کاری (بوون) و دارشتە هاوڕێزمانەکەی نەبێت، کە بریتیە لە (هەبوون). لە ڕاستیدا، ئەم دوو کارە گیرفانێکی تایبەتی دەکەنەوە و نەفرین دەکەن لە ئەم دیاردەیە و لە چەند دیاردەیەکی تر[١٦]. بە ئەم کردەوەیەیش، کەڵکێکی گەورە دەبەخشن بە باری بیردۆزەیی لە ڕێزمانەکەدا. بۆ نموونە، رستەی (من مامۆستا بووم) و رستەی ( من هەبووم) ناتوانن ڕەگەزی (ەوە) وەربگرن، کەچی لە کاری (بوونی بوونایەتی)دا، وەك (من دڵشاد دەبم، من دڵشاد بووم)، ئەو ڕەگەزە پەسەند دەکرێت و دەگوترێت: (من دڵشاد دەبمەوە، من دەڵشاد بوومەوە). بە ئەم شێوەیە، باری (گشتایەتی) لە ئەم ڕەگەزەدا دەردەکەوێت و سەرپاکی کاری زمانەکە، بێجگە لە (بوون و هەبوون)، ئەو پاشگرە پەسەند دەکەن.

### ٤/١٠: گشتایەتی لە گەردانکردنی کاردا:

لە خاڵی پێشوودا گوترا: پاشگری (ەوە) گشتیە ڕوو دەکات لە هەموو کارێك. لە ئەم ڕووەوە، دەبینین کە هەر هەموو ئەو ڕێژە و ناوانەی کە لە سەر بنجی ئەو کارە ڕۆدەنرێن، ئەو ڕەگەزە پەسەند دەکەن. بۆ نموونە، کاتێك کە کاری (کەوتن) ئەو مۆرفیمەی وەرگرت و بوو بە کاری (کەوتنەوە)، ئەوا بەرانبەر بە خشتەی گەرداننامەی کاری (کەوتن) خشتەیەکی تر پەیدا دەبێت بۆ گەرداننامەی کاری (کەوتنەوە). پاشان، وەك کاری (کەوتن) دەتوانێت پێشگری واتاگۆڕی وەك (هەڵ، دا، ڕێك، بەر، سەر، دەر، ژێر، دوا، لێ، تێ، ...) وەربگرێت، کاری (کەوتنەوە)یش دەتوانێت بە گەردانناماەی هەموو ئەو

---

(١٦) لە سەرچاوەی (١)دا، ئێمە بە دوور و درێژی لە سەر ڕێزمانی ئەو گیرفانە تایبەتیە دەدوێین.

کارانەوە دەربکەوێت. بە ئەم چەشنە، دەبینین کە هیچ ڕەگەزێکی ڕێزمانی نیە کە بتوانێت پسوولەی هات و چۆ بسەنێتەوە لە ئەم کەرستە گشتیە، مەگەر خۆی خۆی بوەستێنێت، کاتێك کە ناتوانێت دوو جار بلکێت بە هەمان کارەوە.

### ٥/١٠: خانەی پاشگری (ەوە) لە ناخی بیردا:

لە ئەو بیردۆزەیەدا کە لە سەر پلیکانەی بنیادی ڕستە بڵاومان کردوەتەوە، ئێمە خانەی (-٨)مان تەرخان کردوە بۆ ئەو ڕەگەزە[١٧]. واتە، پاشگری (ەوە) دەکەوێتە ژێر بنجی کارەکە و هەفت خانەی ڕێزمانی هەیە کە بتوانێت لە یەکتری جودایان بکاتەوە. بۆ نموونە، لە ڕستەیەکدا وەك (بریا سووت|ێنـ|ـر|ا|بوو|با|-|ن|ـەوە)، شەش ڕەگەزی ڕێزمانی هەیە لە نێوان بنجی (سووت) و پاشگری (ەوە)دا، وەك لە خوارەوە بە شێوازێکی ستوونی شیکاری بۆ کراوە:

(بریا) : کەرستەی گونجاندنی ڕستەکە (نیازداری)

(سووت) : بنجی کاری سووتان (خانەی سفر)

(ێن) : ڕەگەزی تێپەڕاندن (ێن)، (خانەی (-١)

/ر/ : ڕەگەزی بکەر نادیار /ر/، خانەی (-٢)

(ا) : نیشانەی ڕابردوو (ا)، خانەی (-٣)

(بوو) : نیشانەی ڕابردوی دوور، خانەی (-٤)

(با) : نیشانەی نیازداری لە ڕابردوودا، خانەی (-٥)

(-) : خانەی (-٦)، خانەی جێناوی جێگۆڕ، لە ئەم نموونەیەدا پێویست نیە.

(ن) : جێناوی جێنەگۆڕ بۆ (جێگری بکەر)، خانەی (-٧)

(ەوە) : ڕەگەزی دووپات کردنەوە، خانەی (-٨)

---

[١٧] لە گشت نووسینەکانی ئێمەدا، بە تایبەتی لە کتێبە بڵاوکراوەکاندا، ئێمە ئەو خانەیەمان تەرخان کردوە بۆ ئەوە ڕەگەزە. لە ئەم ڕودوە. وا دەیان ساڵە لە سەر ئەوە بیردۆزەیە دەڕۆین و تا ئێستا دژنموونە پەیدا نەبوە.

ئەم ڕەگەزە، هەرچەندە ڕۆڵەکەی زۆر گرنگ بێت، بەڵام جێگاکەی زۆر دوورە لـە بنجـی کارەکـەوە، تەنانـەت، دەکەوێتـە پـاش هـەردوو جێنـاوە لکاوەکـەی (بکـەر) و (بەرکار)، لە خانەی (-٦) و (-٧)دا.

### ٦/١٠: پاشگری (ەوە) لە دەنگسازیدا:

بە سەرنجێکی رووکەشی لە رەگەزی (ەوە)، دەبینین کە دوو بزوێنی (ـە) هـەڵ دەگرێت، ئەمەش وا لە ئێمە دەکات کە بڵێین: ئەم پاشگرە لە دوو برگە پێکهاتوە، چونکە هەر بزوێنێك لە ئەو دوانە دەبێت بە نـاوکی برگەیـەك و لـە تاڵگـەی زارەوە دەکەوێتـە خوارەوە، وەك[١٨]:

یەکەم: برگەی یەکەم ناتەواوە و هەر لە یەك بزوێن پێکهاتوە لە چەشنی: (ـە : QVo).
دوەم: برگەی دوەم: تەواوە و لە (نەبززوێن)ی (و) و لە بزوێنی (ـە) پێکهاتوە، وەك: (وە: CVo).

لە رووی فۆنۆلۆژیەوە، ئەم دوو برگەیە، کە یەکێکیان چێوە ناتـەواوە و ئـەوی تریان چێوە تـەواوە، دوو ڕۆڵـی جیـاواز دەبیـنن. برگـەی ناتەواوەکـە (QVo) ڕۆڵەکـەی نادروستە، یان (سلبی)یە و بە هەموو نرخێك دەنگێکی (نەبزوێن) دەپچرێت بـۆ ئـەوەی ناتەواویەکەی خۆی تەواو بکات و بتوانێت لە باجگەی زار دەرباز ببێت[١٩]. برگە تەواوەکە (CVo) ڕۆڵێکی دروست (ایجابی) دەبینێت و دەتوانێت پەنا بدات بە دەنگێکی (نەبزوێن) و جێی بکاتەوە، ئەم راستیەیش لە سەر ئەم نموونەیە دەردەکەوێت: (هاتـە|وەو دانیشت). بە سەرنجێکی ورد، دەردەکەوێت کە گۆکراوی (تە|وەو) لە دوو بڕگە پێکهاتوە (تە + وەو). لە بڕگەی (تە)دا، سەری بزوێنی (ـە) دەنگی /ت/ی فڕاندوە لە (هات) گرێی جوتەدەنگی (تە)ی چێکردوە، تا بتوانرێت گۆ بکرێت، لە پاش بڕگەی قوتکراو (ها). لە بەرانبەردا، لە

[١٨] خوێنەری نازیز دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی (٦). لە ئەوێدا، بە وردی لە سەرچێوەی بڕگە دواوین.
[١٩] بۆ نموونە، کاتێك کە پاشگری (ەوە) لـە دەم دەردەچێت، هـەر دەبێـت لـە سـەرەوە لکاوبێـت بـە (نـەبزوێن)ێکی خوازراوەوە، وەك (ـ تەوە، ـ یەوە، ـ وەوە، ـ رەوە).

بڕگەی تەواوی (وە)دا دەنگی نیمچەبزوێنی (و)ی پەنا دراوە و بوە بە بڕگەی پڕی (وەو: CVc). بە کورتی لە ئەم کارلێکە دەنگسازیەدا، ئەم هاوکێشەیە پەیڕەو دەکرێت:

هات + ەوە + و + دانیشت ← ها | تـ.ـە | وەو | دانیشت

**۷/۱۰: ئەرکی واتایی لە پاشگری (ەوە)دا[20]:**

وەك لە پێشەوە باسکرا، بە شێوەیەکی گشتی و بەبێ جوداکاری، ئەگەر پاشگری (ەوە) دەرکەوت لە ڕێژەیەکی (کار)دا، ئەوا سێ ڕێچکەی پانی واتایی پڕ دەکاتەوە، وەك:

(۱): پاشگری دژواتایی لە (ەوە)دا، واتە: تەواوکرنی ڕووداوی کارێکی دی.

(۲): پاشگری واتاگۆڕ (ەوە)، واتە: گۆڕینی واتای بنجی کارێك.

(۳): پاشگری واتابەست (ەوە)، واتە: زیندووکرنەوەی واتا لە فۆرمێکی بێواتادا.

کەواتە، ئەو ڕەگەزە یەك فۆرمی دەنگی هەیە وەك (ەوە)، وەلێ ئەو فۆرمە دەنگیە دەتوانێت سێ فۆرمی واتایی هەبێت، بۆ نموونە، لە ڕستەیەکدا وەك (مـن بردمەوە)، ئەگەر واتا گۆڕینی کاری (بردن) بێ بایەخ بکەین، ئەوا واتای (دووبارە بوونەوە) هەیە وەك (بۆ دوەم جار نامەکەم بردەوە). هەر لە بەر ئەو سەدەمە، دەشێت باری یەکەم (دووبارەبوونەی ڕووداوی کار) بە ئاوەڵکارێکی وەك (بۆ دوەم جار، دیسان) پتەو بکرێت، چونکە لە هەردوو باری (۲) و (۳)دا دەشێت هەمان (دووبارەبوونەی ڕووداوی کار) هەبێت. لە ڕاستیدا، ئاوەڵکارێکی وەك (دیسان) دەتوانێت هەردوو ڕستەی (دیسان پارەکەت بردەوە) و (پارەکەت بردەوە) لە یەکتری جودا بکاتەوە بۆ دوو واتای جیاواز. لە لایەکی ترەوە، ڕەنگە کەسانێك بڵێن: لە ڕێچکەی سێیەمدا، یان لە نموونەی (کووژانەوە، چەوسانەوە، ...)دا، دووبارەبوونەوە نیە. لە بەرانبەردا، ئێمەیش دەڵێین: ئەم نموونانە فۆرمی فۆنەتیکیان دوولۆیە، بەڵام فۆرمی واتاییان یەکلۆیە. بە هەمان شێوە، لە

---

[20] لە پاشتردا، بە شێوەیەکی وردتر لە واتای پاشگری (ەوە) دەدوێین. واتە، مەبەستی ئەم کۆپلەیە و کۆپلەکەی پاشتر ئەوەیە (ئەرکی گشتی) لە (ئەرکی تایبەتی) جودا بکەینەوە.

ڕێچکەی دوەمدا، یان لە نموونەی (سووتانەوە، کردنەوە، بڕینەوە...)دا، دووبارەبوونـەوە نیە، چونکە ئەم نموونانەیش فۆرمی فۆنەتیکیان دوولۆیە، بەڵام فۆرمی واتاییان یەکلۆیە. بـە پێچەوانەوە، لـە ڕێچکەی یەکەمـدا، یـان لـە نموونـەی (خەوتنـەوە، کڕینـەوە، ...)دا دووبارەبوونەوە هەیە، چونکە هەم فۆرمی فۆنەتیکیان دوولۆیە و هـەم فـۆرمی واتاییـان دوولۆیە. زێدەباری، ئەگەر سەرنجی ئەو کارانە بـدەین کـە پاشـگری (ەوە) هـەڵ دەگـرن، دەبینین کە دوو سیستمی واتایی دەکەونە بەر پرۆسەی (یەکتربڕین)، وەك:

سیستمی یەکەم: واتای دووبارەبوونەوەی ڕووداوی کارەکە بە شێوەیەکی سەرتاسەری لـە هـەموو زمانەکانـدا. ئـەم جـۆرە واتایـە هـەموو نموونەیـەك دەگرێتـەوە و دەشـێت بـە کەرستەیەکی دەرەکی وەك (دیسان، دیسانەوە، جارێکی تر، ...) واتـای دووبارەبوونـەوەی ڕووداوی کارەکە بچەسپێنرێت.

سیستمی دوەم: یان سیستمی تایبەت بە دژواتایی لە (ڕێچکەی یەکەم)ی واتاکانی پاشگری (ەوە)دا، (وەك لە کۆپلەی داهاتوودا باس دەکرێت).

لە هەندێك کاردا، واتە لە بەشێکی تایبەتیدا، واتا گۆڕین هەیە. هەر بۆ نموونە، کاری (نوستنەوە) هەر واتای (دووبارە نووستن) دەدات و ڕووداوی کارەکە ملکەچ دەبێت بۆ هەردوو سیستمەکە. بەرانبەر بە ئەم نموونەیە، کاری (بردنەوە) خـۆی جـودا دەکاتـەوە، چونکە دوو واتا دەداتەوە، وەك:

(١): دووبارەبوونەوەی ڕووداوی کاری بردن (بردن)

(٢): ڕووداوی یەکلۆی کاری (بردنەوە)، بە واتای (بوون بە هی خۆ)

کەواتە، ئەگەر واتای گشتی (دووبارە) بپارێزین لە بیردا، ئەوا واتاکە ناگۆڕێت و ئەگەر لای ببەین، ئەوا واتاکە لە (بردن)ەوە دەگۆڕێت (بردنەوە). بە ئەم پێیە، لە ئەو

جۆرە کارەدا پاشگری (ەوە) دەتوانێت هەر یەك ئەرك ببینێت لە یەك نموونەدا و هەموو جارێك ئەرکی تایبەتی واتاگۆڕین (ڕێچکەی دووەم) زاڵترە لە ئەرکی دووبارەبوونەوە (ڕێچکەی یەکەم)، لە بەر ئەم هۆیانە:

یەکەم: وەك ئەرکی (دووبارەبوونەوە) گشتیە و لە خۆوە هاتوە، ئەرکی (واتا گۆڕین) تازە پەیدا بوە بۆ گرتنی کەلێنێکی واتایی بۆ کارێکی پێویست. واتە، ئەگەر ئەم کەلێنە تازەیە پێویست نەبا بە تەواوی، ئەوا پەیدا نەدەبوو، هەر لە بەر ئەوە، بە واتا زاڵترە.

دووەم: لە رستەیەکدا، وەك (مـن بردمـەوە)، ئەگـەر واتایـەکی دوو لایەنـە هـەبێت و (دووبارەبوونەوە) هەبێت لە بیردا، ئەوا زۆرتر پێویست بە ژینگەیەکی دەرەکی دەکات. واتە، دەبێت هەندێك کەرەستەی ریز بکەین لە دەرەوەی ڕێچکەکە، تا واتاکەی (بـردن) لانەدات بەلای واتای گۆڕاوی (بردنەوە)دا (ریچکەی دووەم). لـە پێداچـوونەوەی (٢٠١٦)دا، جەخت دەکەینەوە لە سەر ئەوەی کە دەبێت (دووبارەبوونەوەی ڕووداو) پتەو بکرێت بە کەرەستەیەك، وەك: (دیسان، دووبارە، جارێکی دن، ....).

**٨/١٠: ڕێچکەی یەکەم: دژواتایی:**

لە بەشەکانی پێشودا گوترا: سێ ڕێچکەی پان هەیە بۆ واتای هەر ڕێژەیەك کە بە پاشگری (ەوە) کۆمەککرابێت، بەلاّم مەبەستی ئەم کۆپلەیە بریتیە لە (ڕێچکەی یەکەم). لە ئەم جۆرە ڕێچکەیەدا، سێ رارەو هەیە بۆ دووبارەبوونەوەی واتای کارێکی یەکلۆ، وەك:

ڕاڕەوی یەکەم: دووبارەبوونەوە بە وچان:

لە ئەم ڕاڕەوەدا، دژواتاییەکی (لەنگ) هەیە، وەك: (شیلان هەستا و نوستەوە). ئەمە و دیاردەی (دووبارەبوونەوە بە وچان) هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوە کە (نارستەدار) نین، وەك[٢١]:

---

[٢١] ئەگەر بە چاوی لێکۆڵینەوە و بە سەرنجی ورد بروانین لە کارەکان، دەبینین (ناراستەی ڕوودان) بریتیە لە ناکارێکی واتاسازیانەی پتەو. هەر لەبەر ئەوە، لە سەرچاوەی (٩)دا، زۆر بە وردتر لە ئەم دیاردەیە دەدوێین.

شیلان نوست و هەستا و دیسان نوستـەوە

کەواتە، ئەم جۆرە واتاگۆڕکێیە لە نێوان سێ کاردا ڕوو دەدات، وەك (نوستن| هەستان| نوستنەوە)، وەك لە ئەو نموونەیەدا چەسپاوە.

ڕاڕەوی دوەم: دژواتایی بە نیوسووڕ:

ئەم ڕێچکەیە تەنها ئەو کارانە دەگرێتەوە کە (دژواتا)، یان (دژئاراستە)یان هەیە. لە ئەم مانایەدا، کاتێك کە کراسی پاشگری (ەوە) دەگرێتەبەر، واتای کارەکە دەبێت بە (تەواوکەر) بۆ کارێکی (دژواتا)، یان (دژئاراستە)، وەك[22]:

شیلان دوێنێ کراسێکی کڕی، بەڵام ئەمڕۆ فرۆشتیەوە

شیلان دوێنێ هات، بەڵام ئەمڕۆ ڕۆیشتـەوە

لە نموونەی یەکەمدا کاری (فرۆشتنەوە) بوە بە تەواوکەر بۆ کارە دژواتاکەی (کڕین)، چونکە بەرکارەکە (کراس) جارێك بەرەو لای شیلان جوولاوە و جارێکی تر لێی دوور کەوتوەتەوە. لە نەخشەی (١/١٠)دا، کاری (ڕۆیشتنەوە) بوە بە تەواوکەرە دژئاراستەکەی کاری (هاتن). لە باری پێچەوانەوەدا، بە هەمان شێواز، دەتوانین کاری (کڕینەوە) و (هاتنەوە) بکەین بە تەواوکەر بۆ (فرۆشتن) و بۆ (ڕۆیشتن)[23]. لە سەر نەخشەکە، ئەو دژواتاییە نیگارکراوە بە (نیوسووڕ)، یان بە (١٨٠ پلە).

[22] بۆ نموونە، بەرانبەر بە ئەو دوو نموونەیە، دەتوانین بڵێین: (شیلان دوێنێ کراسەکەی فرۆشت، بەڵام ئەمڕۆ کڕییەوە). یان، (شیلان دوێنێ ڕۆیشت و ئەمڕۆ هاتەوە).

[23] ئەتڵەسی ئەم جۆرە واتا بەرتەسك و تایبەتیە زۆر بەرفراوانتر و زۆر بەربەرینترە. لە ئێرەدا، هەر ئەوەهەندە بەسە. لە داهاتوودا، نووسینێکی تەواو تەرخان دەکەین بۆ ئەم دیاردە ڕێزمانییە گرنگە. (بڕوانە بۆ سەرچاوەی ژمارە ٩).




نەخشەی (١/١٠): دووبارە بوونەوە بە نیوسووڕ

**ڕاڕەوی سێیەم: دژواتایی بە سووڕی تەواو:**

**ئەم ڕێچکەیە تەنها ئەو کارانە دەگرێتەوە کە (دژواتا)، یان (دژئاراستە)یان هەیە. لە ئەم مانایەدا، کاتێك کە کراسی پاشگری (ەوە) دەگرێتەبەر، واتای کارەکە دەبێتەوە بە (هاوئاراستە)، وەك:**

**شیلان پێرێ هات، بەڵام دوێنێ ڕۆیشتەوە، کەچی ئەمڕۆ دیسان هاتەوە**

**لە ئەو نموونەیەدا کە لە سێ ڕستە پێکهاتوە کاری (هات) یەکلۆیە و کاری دوەم (ڕۆیشتەوە) دوولۆیە و بوە بە تەواوکەری دژواتاکە (ڕاڕەوی دوەم)، بەڵام کاری سێیەم، کە دوولۆیە، بوە بە تەواوکەدژواتای کاری دوەم (ڕاڕەوی دوەم). کەواتە، لە نێوان ئەو سێ کارەدا دوو جار دژواتای بە (نیو سووڕ) چەسپاوە. بە واتایەکی دن، لە نێوان کاری یەکەم (هات) و کاری سێیەم (هاتەوە) سووڕێکی تواوی (٣٦٠ پلە) چەسپاوە. لە سەر نەخشەی (٢/١٠) ئەو دژواتاییە نیگارکراوە و بە دوو (نیوە سووڕ) پیشان دراوە.**




نەخشەی (٢/١٠): دووبارە بوونەوە بە سووڕی تەواو

**٩/١٠: ڕێچکەی دوەم (واتاگۆڕکێ):**

**لە ئەم ڕێچکەیەدا، واتا گشتیەکە نە دووبارە دەبێتەوە و نە دەبێت بە (دژواتا). بە پێچەوانەوە، واتاکە دەکەوێتە بەر بیردۆزی (تەسکبوونەوەی واتایی) و دەگۆڕێت بۆ واتایەکی زۆر تایبەتی و دیاریکراو، وەك[٢٤]:**

**- بڕینەوە: (بڕین)ی دارێك بە شێوەی دەراودەر و گردەبڕ، یان (بڕین تا دوا تنۆك).**
**- جوولانەوە: (جوولانەوە)، بە بلاّو بوونەوە و بە تەنینەوە.**
**- سووڕانەوە: (سووڕان) بە شێوەیەکی بەردەوام.**

**بە ئەم چەشنە، دەبینین لە ئەم واتا تەسکەدا ڕووداوی کارەکە دەکەوێت بەسەر بارێکی تایبەتیدا. لەگەڵ ئەوەیشدا، ڕەگەزی (ەوە) کراسێکی گشتی نیە بۆ تەسك کردنەوەی واتایی، بەلاّم بریتیە لە کراسێکی تایبەتی بۆ هەندێك لە کارەکان و زۆربەیان ئەم واتا گۆڕینە پەسەند ناکەن[٢٥].**

**١٠/١٠: ڕێچکەی سێیەم (واتابەستی):**

**لە ئەم ڕێچکەیەدا، پاشگری (ەوە)، نە واتای ڕێچکەی یەکەم و نە واتای ڕێچکەی دوەم هەڵ دەگرێت. بۆ نموونە، لە کاری (کووژانەوە)دا، پاشگری (ەوە) نە واتای دووپاتی و نە واتای گۆڕاو نیشان دەدات. تەنها هەر فۆرمی بێواتای (کووژان) دەکات بە (واتادار) و**

---

[٢٤] لە ئەم ڕوەوە. هەندێك لە ڕێزماننووسان ئەو کارانەیان باسکردوە، کە بە پاشگری (ەوە) واتایان ناگۆڕێت. ئێمەیش هەروەك ئەوان ئامارمان کردوون. بەلاّم ئەو زانیاریانە ڕەنگە بگۆڕێن لە پاش یەکلایی کردنەوەی ڕێزمانی پاشگری (ەوە). ئەمەیش لە بەر ئەوەی کێشەکە لە ڕووی تیۆریەوە دابین نەکراوە و ئەوەی گوتراوە زۆر سادە و بێ بنەمایە. لەلایەکی ترەوە، ئەم کێشەیە دەنالێنێت بە واتای (خوازراو)ەوە. کە هێشتا ئەویش وەك پێویست باس نەکراوە.

[٢٥] لەگەڵ ڕێز و سوپاسدا، زۆر کەڵك وەرگیراوە لە بیروبۆچوونەکانی دکتۆر (نەسرین فەخری) لە سەرچاوەی (٨)دا.

واتاکە دەبەسترێت بە هەبوونی ئەو پاشگرەوە (ەوە). بە راستی، نموونەیەکی زۆرمان هەیە لە ئەم جۆرە کارە، وەك: (بریسکانەوە، بوورانەوە، پەرچانەوە، پلیشانەوە، پووچانەوە، پووکانەوە، تلیسانەوە، توانەوە، چەمانەوە، رەوانـەوە، رازانـەوە، رووتانـەوە، شـەکانەوە، کولانەوە، کرووزانەوە، نووزانەوە، قۆزتنەوە، گواستنەوە، شاردنەوە، هۆنینـەوە، ...). لـە ئەم کارانەدا دیوی یەکلۆ سست و بێواتایە، بەڵام دیوی دوولۆ واتـادارە، چونکە پاشگری (ەوە) بوە بە پێکهاتەیەکی نەگۆڕ لە واتای کارەکەدا.

### ١١/١٠: بەرەنجام و لێکدانەوە:

لە زمانەکەدا، بە تایبەتی لە (واتاگۆڕین)دا، مـۆرفیمی دووپـاتی (ەوە) رۆلێکی گـەورەی هەیـە. هـەر لەبـەر ئـەوە، ئێمـە بایـەخێکی تـەواومان پـێ داوە، وەك لـە ئـەم بەرەنجامانەدا پیشانداوە، وەك:

- هەرچەندە جۆرەکانی پاشگری (ەوە) زۆر جوداواز بن لە زمانەکەدا، بەڵام تەنها هەر (پاشگری کار) جێی مەبەستە لە ئەم نووسینەدا. ئـەم کەرەسـتەیەیش زۆر گشتیە و دەچێتە سەر هەموو کاری زمانەکە، بێجگە لە (بوون و هەبوون).
- وەك کەرەستەی (ەوە) گشتیە بۆ هەموو کارێك، لە هەر کارێکدا گشتیە بۆ ئەوەی بچێتە سەر هەر رێژەیەك، یان ناوێك کە لـە سـەر بنجی ئـەو کـارە رۆنـرابێـت. ئەمـەیش مـۆرکێکی رەسـەن و تایبەتـەی دەبەخشـێت بـە زمانەکـە. بـە پێـی شارەزاییمان، ئەگەر لە زمانی تریشدا هەبێت بە ئەو برشتە نیە.
- جێگای هەندەسی پاشـگری (ەوە) جێگایـەکی هەرەمـەکی و پـەرپووت نیـە. بـە پێچەوانەوە، خانەی (-٨) داگیر دەکات لە ناخی بیردا، یان لە پلیکانەی رستەدا.
- لە رووی دەنگسازیەوە، پاشگری (ەوە) دوو بزوێنی ساغی تێدا هەیە لە چەشنی (ـە). ئەو دوو بزوێنە لە ریزی گوفتاردا دەبن بە ناوکی دوو برگە. برگەی یەکەم چێوەکەی (ناتەواو)ە و لە باجگەی دەمـدا بـاجی خـۆی دەسـتێنێت لـە برگـەی

پێشتر. لە بەرانبەردا، برگەی دووەم (وە) چێوەی تەواوی هەیە و ئاژاوەی ئاوەها پەیدا ناکات لە ڕێزەکەدا.

لە ڕووی واتاسازیەوە، پاشگری (ەوە) سێ ڕێچکەی بەرین دەکاتەوە، بۆ سێ مۆرفیمی ڕێزمانی، وەك:

(١): ڕێچکەی یەکەم: دژواتایی بە تەواوکردنی واتای کارێکی تر.

(٢): ڕێچکەی دووەم: گۆڕینی واتای بەرفراوانی کارێك بۆ واتایەکی بەرتەسك.

(٣): ڕێچکەی سێیەم: بەستنی واتا لە سەر فۆرمێکی بێواتا.

- لە ڕێچکەی یەکەمدا، سێ ڕارەوی واتایی بەدی دەکرێت، وەك: (دژواتایی بە وچان/ دژاتایی بە نیوسووڕ/ دژواتایی بە سووڕی تەواو).
- لە ڕێچکەی دووەمدا، بە پێچەوانەی ڕێچکەی یەکەم، لە ڕێچکەی دووەمدا واتای گشتی و رەهای کارە بنجیەکە تەسك دەبێتەوە بە سەر واتایەکی تایبەتیدا. لە ئەم روانگەیەوە، ڕووداوی کارەکە کراسی واتایەکی نوێ لە بەر دەکات. لەلایەکی ترەوە، ئەم کراسە گشتی نیە و لە هەندێك کاردا هەیە و لە زۆری تردا نیە. هەر لە بەر ئەوە، پاشگری (ەوە) کراسێکی تایبەتیە لە ئەم جۆرە واتایەدا، بەلاّم بە سێ ڕارەودا، وەك: (ڕوودان تا دوا تنۆك/ ڕوودان بە بلاّوبوونەوە/ ڕوودان بە بەردەوامی).
- بە پێچەوانەی ڕێچکەی دووەم، لە ڕێچکەی سێیەمدا واتای گشتی و رەهای کارە بنجیەکە تەسك نابێتەوە بە سەر واتایەکی تایبەتیدا، بەلاّم واتای کارێکی سەربەخۆ پەیدا دەکات لە فۆرمێکی مردوودا. بۆ نموونە، هەردوو چاوگی (توان و تلیسان) مردوون بە واتا، بەلاّم لە باری دوولۆدا پاشگری (ەوە) زیندوویان دەکاتەوە و دەیان کات بە واتادار وەك: (توانەوە، تلیسانەوە). کەواتە، ڕووداوی کارەکە کراسی واتایەکی سەربەخۆ دادەهێنێت بە (بووژاندنەوە).

- **بەپێ ئەو سێ ڕێچکە واتاییە، زاراوەی (پاشگری دووپاتی ەوە) زۆر نابەجێیە و دەشێت بگۆڕدرێت بە (پاشگری ەوە)، چونکە لە ڕێچکەی یەکەم و دووەم و سێیەمدا، سیمای (واتاگۆڕین) لە ڕووداوی کارەکەدا زۆر زاڵترە.**

**لە ئەم نووسینەدا، تەوەری باسەکە تەنها و تەنها هەر واتای بنجی دەگرێتەوە. واتە، واتای خوازراوی نابنجی جێی مەبەست نیە. لە ئەم ڕووەوە، واتای نابنجی بریتی نیە لە تەواوکەر بۆ باسەکە. لەبەرانبەردا، بریتیە لە بارێکی (هاوتەریب) بە واتای بنجی. هەر لە بەر ئەوە، ئەگەر لە یەکەم هەنگاودا واتای بنجی دابینکرا، ئەوا لە دووەم هەنگاودا، واتای خوازراو بە ئاسانی دابین دەکرێت.**

**سەرچاوەکان:**

١ د. شێرکۆ بابان، (میکانیزمە بنەرەتییەکانی ڕستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون)، هەولێر ١٩٩٧.

٢ ڕەئوف ئەحمەد ئالانی، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨١.

٣ د. نەسرین فەخری، چاوگی بێ واتا لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٧٣.

٤ شێخ محەمەد خاڵ، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٧٤.

٥ نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا ١٩٥٨.

٦ د. شێرکۆ بابان، چێوەی برگەی دەنگسازی، گۆڤاری مەتین، ژمارە ٧٦، ١٩٩٨.

٧ مەسعود محەمەد، وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٤.

٨ د. نەسرین فەخری، پاشگر و پێشگری (ڤە یان وە) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٧٣

٩ د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ەوە)، هەولێر ٢٠٠١.

# بابەتی یازدەیەم

## واتاسازی لە پاشگری (ەوە)دا[26]

لە ساڵی (١٩٩٤)دا دەستمان کرد بە نەخشەی نووسینەوەی چەند کتێبێك لە سەر واتاسازی لە کاری زمانەکەدا. بێگومان، ئەو ئەرکە زۆر زۆر گران بوو و زۆر کێشەی تایبەتی پەیدا دەبوو کە بە (زمانەوانی گشتی) چارەسەر نە دەکراو پێویستی بە ئەوە دەکرد کە لێکۆڵینەوەی تایبەتی بۆ بکرێت و چینە واتاییەکان لە یەکتر جودابکرێنەوە[27]. لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا (١٩٩٤-١٩٩٩) بیری ئێمە لە ئاستی ئەو کێشانەدا وەك لێدانی دڵ نەوەستاوە و هەر لە ژێرەوە و لە دڵەوە لە گەڵ ئەو گێژاوەدا ژیاوین. لە راستیدا، یەکێك لە ئەو کێشانە بریتی بوو لە کێشەی پاشکری (ەوە)، بە تایبەتی لە واتاسازیدا. لەم ئەم ڕووەوە، چەندین جار بابەتەکە نووسراوەتەوە و پاشان کراوە بە کتێبێك، بەڵام لێڵی و تەم و مژ هەر دەمایەوە، چونکە بابەتەکە بە جوانی نەدەچوە نێو چوارچێوەی نووسینەوە. لە ئەم ڕوانگەیەوە، دەمانبینی، نە لە زمانی تردا ئەم کێشەیە هەیە و نە ڕێزماننووسانی خۆمان توانیویانە یەکلایی بکەنەوە. ئەمە و بابەتەکە زۆر زۆر بێ خزمەتە، هەرچەندە چەند مامۆستایەك لێی دواون[28] بەڵام بە شێوەیەکی زارەکی و بە توێژاڵێکی تەنك. لە گەڵ هەمووو ئەوەیشدا، مامۆستای خوالێخۆشبوو (ڕەئووف ئەحمەد ئالانی) کتێبێکی فراوانی نووسیوەتەوە لە سەر پاشگری (ەوە)[29]، بەڵام لە ڕووی واتاسازییەوە، هەر وەك ئیشەکانی پێشتر وایە. لە زمانانی تردا، ئەم کێشەیە نیە و ئەو پاشگرە ئەگەر هەبێتیش

---

[26] گۆڤاری ( ڕۆشتبیری کوردستانی). ژمارە (١). هەولێر ١٩٩٩

[27] بە تەریبی لەگەڵ ئەم نووسینەدا، نووسینێکی تر بە ناونیشانی (پاشگری دووپاتکردنەوە" ەوە" لە شێتەلکاری دا) ئامادەکراوە. لە ئەوێدا بە کورتی لە سەر بابەتی واتاسازی دواوین. ئەو نووسینە بریتیە لە بابەتی پێشوو (بابەتی دەیەم) لە ئەم کتێبەی بەردەستدا.

[28] بڕوانە بۆ سەرچاوەکانی (٢. ٣. ٥. ٦).

[29] بڕوانە بۆ سەرچاوەی (٥).

وەك (re) لە فەرەنسی و لە ئینگلیزیدا[٢٠] بە ئەو قەبارەیە و بە ئەو گرنگیە نیە، کە لە زمانە شیرینەکەی ئێمەدا هەیە. لە زمانی عەرەبیشدا، ئەوە ئاشکرایە کە ڕەگەزی ئاوەها نیە و بۆ ئەو جۆرە واتایە پەنا دەبرێت بۆ چەند کەرەستەی دەرەکی.

### ١/١١: واتاکانی پاشگری (ەوە):

وەك لە سەرەتادا باسکرا، هەندێك لە ڕێزماننووسان لە سەر واتای دووپاتکردنەوە (ەوە) دواون و بیروبۆچوونی جوانیان ڕیزکردوە. لە لایەن ئێمەوە، ئەو جۆرە ئیشە هەر هەمووی ناتوانێت پاراومان بکات، چونکە ناتوانێت ڕێزمانی ئەم کەرەستە گرنگە بە دانسقەیی دابپۆشێت. لە ڕاستیدا، لە ئێرەیشدا دووبارەی دەکەینەوە، ئەم ڕەگەزە بریتیە لە تایبەتمەندیەکی ڕێزمانی کوردی و چالاکیەکی زۆر گەورە دەنوێنێت، چی بە (فرەوتایی) و چی بە (واتاگۆڕکێ). لە گەڵ ئەوەیشدا، ئێمە زۆر بیرمان گوشیوە و زۆر وێنەی ئەم کەرەستەیەمان گرتوە بە زوومی شیکارسازی، تا بتوانین بیروبۆچوونێکی نوێ بخەینە سەر پەڕە و پێشکەشی بکەین بە خوێنەرانی ئازیز. ئەوەیش لە یاد نەکەین کە باری واتاسازی پاشگری (ەوە) زۆر زۆر ئاڵۆز و چڕە و کوردیزانی پتەو نەبێت، کەس ناتوانێت چینە واتاییەکانی لە یەکتری جودا بکاتەوە. بەم ئەم پێیە، لە یەکەم هەنگاودا دەتوانین دابەشکردنێك پێشکەش بکەین بۆ سێ ڕێچکەی پان و سەرەکی لە واتادانەوەی مۆرفیمی (ەوە)دا، وەك[٢١]:

ڕێچکەی یەکەم: دوولۆبوونەوە، یان دووبارەبوونەوەی ڕووداوی کارەکە. واتە سەرلەنوێ واژکردنەوەی ڕووداوی کارەکە، بەڵام بە دژواتای کارێکی پێشتر. لە ئەم ڕێچکەیەدا، سێ ڕاڕەوی پەیدا دەبن بۆ سێ جۆر لە واتا:

---

[٢٠] سەرچاوەی (٧) بریتیە لە فەرهەنگی گەردانکردنی کاردکان لە زمانی فەرەنسیدا. لە ئەوێدا (١٢) هەزار کار گەردانکراوە. سەرچاوەی (٨) بریتیە لە فەرهەنگی گەردانکردنی (٦) هەزار کار لە زمانی ئینگلیزیدا.

[٢١] وەك لە بابەتی پێشوودا باسکرا.

(١): دژواتایی به وچان

(٢): دژواتایی به نیوسووڕ

(٣): دژواتایی به سووڕی تەواو

ڕێچکەی دوەم: تەسکبوونەوەی واتای گشتی له ڕوودانی کارەکەدا بەرەو واتایەکی تەسك وتایبەتی و گۆڕاو. ئەم ڕێچکەیەیش به چەند ڕارەوێکدا دابەش دەبێت وەك:

(١): ئەنجامدانی ڕووداوی کار تا دوا تنۆك

(٢): ئەنجامدانی ڕووداوی کار به بڵاوبوونەوە

(٣): ئەنجامدانی ڕووداوی کار به بەردوامی

ڕێچکەی سێیەم: واتابەستی، یان زیندووکردنەوەی واتای بنجی له ڕوودانی کارەکەدا. له ڕێچکەی دوەمدا، هەردوو فۆرمی یەکلۆ و دوولۆی کاری (ناسین) و (ناسینەوە) واتادارن، کەچی له ڕێچکەی سێیەمدا وا نیە، چونکە فۆرمی یەکلۆی (توان) واتای نیە، بەڵام فۆرمی دوولۆی (توانەوە) واتادارە. کەواتە، پاشگری (ەوە) له کاری (توانەوە)دا، نه پاشگری دووپاتیە (ڕێچکەی یەکەم)، نه پاشگری واتاگۆڕە (ڕێچکەی دوەم)، بەڵام پاشگری واتا بووژێنەرەوەیە (ڕێچکەی سێیەم).

ڕێچکەی یەکەم ئەو کارانە دەگرێتەوە که (دژواتا)، یان (دژئاراستە)یان، هەیە. به پێچەوانەوە، ڕێچکەی دوەم تەنها ئەو کارانە دەگرێتەوە که واتایان دەگۆڕێت بۆ واتایەکی تازە، بەڵام ڕێچکەی سێیەم ئەو کارانە دەگرێتەوە که بەبێ پاشگری ئەوە واتاکەیان دەمرێت. به کۆی گشتی، له هەر سێ ڕێچکەکەدا، کێشەی واتایی زۆر زۆر زاڵترە له کێشەی دووبارەیی له ڕووداوی کاردا. له شێوەزاری شاری سلێمانیدا، کێشەی (دووبارەیی له ڕووداوی کاردا) سپێردراوە به پاشکۆی (ـەوانێ)، وەك (توایەوە + ەوانێ : توایەوەوانێ، یان توایەوانێ).

**٢/١١: دووبارەبوونەوە بە (وچان):**

بۆ ڕاڤەکردنی ئەم جۆرە واتایە، دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ نەخشەی (١/١١). لە ئەم جۆرە بەکارهێنانـەدا، رووکـاری هاتنەکە لـە (س)ەوە بـۆ (ص) بـەردەوام نـەبوە، بـەڵام رووکارەکـەیش نـەگۆڕاوە. لـە گـەڵ ئەوەیشـدا، وچـانی تێکـەوتوە لـە خـاڵی (د)دا. ئـەو وچانەیش دەشێت (وەستان) بێت، یـان هـەر کردەوەیـەکی تـر بێـت. ئەمـەیش خـۆی لـە خۆیدا، واتایەکی تر دەبەخشێت بە کاری (هاتنەوە). ئەمە و مەرج نیـە لـە ڕێگـادا هـەر یەك (وچان) هەبێت، دەشێت چەندین (وچان) هەبێت. هەر لەبەر ئەوەیە کە دەتـوانین کاری (هاتن) لە (س)ەوە بۆ (ص) بشوبهێنین بە نەریتێکی (ژەم‌ژەم) یان (پچڕ پچڕ) بە هەمان ئاراستە. لە ئەم ڕووەوە، جۆرە نەریتی ئاوەهـا، دەتوانرێـت بخوازرێـت بـۆ شـێوازی هاتنی (ئاو) و هاتنی (کارەبا)، وەك (ئاو هاتەوە) یان (کارەبا هاتەوە).




نەخشەی (١/١١): دژواتایی بە وچان

**٢/١١: دووبارەبوونەوەی دژئاراستە:**

لە نەخشەی (١/١٠)ی بابەتی پێشوودا، لە نێوان دوو کـاری ئاراسـتەداردا، وەك (ڕۆیشـتن، هـاتن)، بـە زەبـری پاشـگری (ەوە)، ئاراسـتەی ڕوودانـی کارەکـە دەگۆڕێـت بـە (١٨٠پلە)، یان بە (نیوسووڕ). بۆ نموونە، کـاری (هاتنـەوە) بریتیـە لـە تەواوکـەری کـاری (ڕۆیشتن)، بەڵام پاش گۆڕینی رووکاری ڕووداوەکە بەرەو ئاخێوەر بە (نیو سوڕ). لە ئەو نەخشەیەدا، چەنـد سەرنجێك هەیە وەك:

یەکەم: لە چینی یەکەمدا (هاتن)ی شیلان دیاریکراوە بەرەو ناخێوەرەکە (بەرەو لای ڕاست).

دووەم: لە چینی دووەمدا (ڕۆیشتنەوە)ی شیلان بوە بە دژ ئاراستە بە (نیوسوڕ)، بەرەو لای چەپ.

### ٣/١١: دووبارەبوونەوەی هاوئاراستە:

به زەبری پاشگری (ەوە)، لە کاری ئاراستەداردا، وەك (ڕۆیشتن، هاتن) ئاراستەی ڕوودانی کارەکە دەگۆڕێت بە (١٨٠پلە)، یان بە (نیوسووڕ). ئەم بابەتە لە کۆپلەی ڕابردوودا ڕوونکرایەوە. بەرانبەر بە ئەمە، لە نێوان کاری (هاتن) و (هاتنەوە)دا سوڕێکی تەواوی (٣٦٠) پلە هەیە، وەك لەسەر نەخشەی (٢/١١) نیگارکراوە. لە ئەم نەخشەیەدا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

یەکەم: لە خانی (س)دا، (هاتن)ی شیلان دیاریکراوە بەرەو ناخێوەرەکە (بەرەو لای ڕاست).

دووەم: لە خانی (ا) بە دواوە، (ڕۆیشتنەوە)ی شیلان بوە بە دژ ئاراستە بە (نیوسوڕ)، (بەرەو لای چەپ).

سێیەم: لە خانی (ج)دا، نیوسوڕی تر چەسپاوە و (هاتنەوەی) شیلان بوە بە دژ ئاراستە لەگەڵ (ڕۆیشتنەوە)کەی، (جارێکی تر بەرەو لای ڕاست).

چوارەم: لە ئەو دوو (نیوەسوڕ)ەدا کە لە خانی دووەم و سێیەمدا دەرخرا، سوڕێکی تەواو دەچەسپێت لە نێوان (هاتن) و (هاتنەوە)ی شیلاندا.

پێنجەم: به سەرنجێکی ورد و ژیرانە، دەتوانین تێ بگەین کە: وەك جیاوازی لە نێوان چاوگی (هاتن) و چاوگی (هاتنەوە)دا بریتیە لە سەربارکردنی پاشگری (ەوە)، جیاوازی ئاراستەیی لە هەمان کاتدا بریتیە لە سوڕێکی تەواوی (٣٦٠) پلەیی. ئەمەیش بە وردی و

بە شێوەیەکی هەندەسیی لە سەر نەخشەکە دەردەکەوێت، کاتێک کە شیلان لە خاڵی (س)ەوە دەبزوێت بەرەو خاڵی (ص)، بە ئەم چەشنە:

یەکەم: شیلان لە خاڵی (س)ەوە دەهێت بەرەو خاڵی (ص)، بەڵام ڕەوتی هاتنەکەی بەردەوام نیە لە سەر ڕووکاری (س ص).




نەخشەی (٢/١١): دژواتایی بە سووڕی تەواو

دووەم: لە خاڵی (د)دا، شیلان دەست دەکات بە گۆڕینی ڕووداوکە و تا لە خاڵی (ا) بە تەواوی دەگۆڕێت و ئەمجارە لە ئاخێوەرەوە دوور دەکەوێتەوە. بە بەراورد لە نێوان خاڵی (د) و (ب)دا ڕووکارەکە بە (١٨٠) پلە دەگۆڕێت[٣٢]

سێیەم: لە خاڵی (ب)دا، شیلان دەست دەکاتەوە بە گۆڕینی ئاراستەی ڕەوتەکەی و تا لە خاڵی (د) بە تەواوی دەگەڕێتەوە سەر ڕووکاری یەکەم و کاری (هاتنەوە) دەست پێ دەکات، کە جێی مەبەستە لە ئەم کۆپلەیەدا.

چوارەم: بە پێی ئەوەی گوترا، ڕێچکەی (س د ا) ڕووداوی (هاتن) دیاری دەکات و ڕێچکەی (ا ب ج) ڕووداوی (ڕۆیشتنەوە)ی دژئاراستە دیاری دەکات. لە بەرانبەردا، هێڵی (ج د س) ڕووداوی (دووبارە هاتنەوە) دیاری دەکات. بۆ نموونە: ئەگەر چەند لێکەوتێکی ئاراستەدار نیگار بکەین لە سەر سووڕەکە (بازنگەکە)، ئەوا ئەم ڕاستیانە دەچەسپێن:

---

[٣٢] واتە ئەگەر دوو لێکەوت (مەماس) لە خاڵی (د) و خاڵی (ب) نیگار بکەین، ئەوا دوو هێڵی تەریب دەردەکەون.

(١): له خاڵی (د)ەوه تا خاڵی (ا)، هەر (هاتن) و نزیك بوونەوه له ئاخیوەر دەچەسپێت.

(٢): له خاڵی (ا)دا ڕووکارەکه دەگۆڕێت (نزیك بوونەوه) و (دوورکەوتنەوه) له ئاخیوەر دیاری ناکات.

(٣): له خاڵی (ا)ەوه تا خاڵی (ج)، ڕووکارەکه هەر (دوورکەوتنەوه) له ئاخیوەر دیاری دەکات.

(٤): له خاڵی (ب)دا، به تەواوی ڕووکارەکه دەبێت به دژ ئاراسته (١٨٠پله) لەگەڵ دوو کاری سەرەکی (س ص).

(٥): به تەریبی له گەڵ خاڵی (ا)، له خاڵی (ج)دا ڕووکارەکه (نزیکبوونەوه) و (دوورکەوتنەوه) له ئاخێرەوه پیشان نادات، بەڵام ڕووکاری نێوان هەردوو خاڵەکه به (١٨٠ پله) دەگۆڕێت.

(٦): له خاڵی (ج)ەوه تا خاڵی (د)، هەر (نزیکبوونەوه) له ئاخیوەر دیاری دەکات به واتای (دووباره هاتنەوه).

به ئەم پێیه و به ئەم شێوازه ئاڵۆزه، دوو واتای جیاواز و زۆر ورد پەیدا دەبێت بۆ (هاتنەوه)، بەم ئەم چەشنه:

واتای یەکەم: دووبارەبوونەوەی دژئاراسته:

وەك کاری (هاتنەوه) تەواوکەری کاری دژواتای (ڕۆیشتن) بێت و ڕووکاری (ڕۆیشتن) به (١٨٠ پله) گۆڕابێت. ئەم بابەته له کۆپلەی پێشوودا باسکرا.

واتای دووەم: دووبارەبوونەوەی هاوئاراسته:

وەك کاری (هاتنەوه) تەواوکەری باری یەکلۆی خۆی بێت (هاتن)، بەڵام ڕەوتەکەی پێچێکی (٣٦٠پلەیی) تێکەوتبێت. واته، له ڕووکاری (هاتن)ەوه چووبێته سەر ڕووکاری دژئاراسته و پاشان جارێکی تر هاتبێتەوه بۆ سەر هەمان ڕووکاری ڕەسەنی (هاتن). یان دەتوانین بڵێین: ڕووداوی (هاتن) سەرلەنوێ واژی کردوەتەوه. ئەمەیش له پاش ئەوەی که کاری (هاتن)ی یەك (لۆ)، لۆیەکی تەواوی خواردوه و بوه به دوو (لۆ).

**٤/١١: دژواتایی لە پاشگری (ەوە)دا:**

ئەم کێشەیە لە کۆپلەی پێشوودا باسکرا، بەڵام مەبەست ئەوەبوو کە دووبارەبوونەوە و واژکردنەوەی رووداوی کاری (هاتن) پیشان بدەین. لە ئەوێدا، ئەوە زانرا کە لە نێوان (هاتن و هاتنەوە)دا سوڕێکی تەواو هەیە. پاشان ئەوە زانرا کە لە نێوان (هاتن) و (رۆیشتنەوە)دا و یان لە نێوان (رۆیشتن) و (هاتنەوە)دا، نیو سووڕی (١٨٠ پلەیی) هەیە. بێگومان ئەو نیوە سووڕە جێی مەبەستە، چونکە رووکارری روودانی کارەکە خۆی لە خۆیدا بریتیە لە (ئاکاری واتاسازیانە). بۆ نموونە، ئەگەر گوترا (شیلان هاتەوە)، ئەوا سێ واتا خۆیان دەردەخەن، وەك:

یەکەم: دووبارە شیلان هاتەوە.

دوەم: شیلان رۆیشت و هاتەوە (گەرایەوە)

سێیەم: شیلان هات و رۆیشتەوە و دیسان هاتەوە.

لە ئەم هەڵوێستەدا، واتای دوەم زاڵترە و شیاوترە و بە گوڕترە، چونکە بریتیە لە (نیوەی تەواوکەر) بۆ (نیوەی یەکەمی بنەڕەت) لە کاری (ڕۆیشتن)، کە کەوتوەتە ژێر لێوەوە. ئەگەرنا، بۆ واتای یەکەم و سێیەم هەموو کاتێك پێویست دەبین بە کەرەستەیەکی دەرەکی وەك (دووبارە)، (دیسان)، (سەرلەنوێ). بە ئەم چەشنە، دەتوانین روو بکەین لە هەندێك کردار کە ماکی ئاراستەداری هەڵ دەگرن. ئەمەیش ئەوە بیردەخاتەوە کە (کاری ئاراستەدار) هەیە و (کاری بێ ئاراستە)یش هەیە. ئێستایش، دەتوانین باری دژا ئاراستەیی و دژواتایی لە کاری (هاتنەوە) و (رۆیشتنەوە) دەربخەین:

لە نەخشەی (٢/١١)دا، وەك چۆن کلك و سەری تیرە دژ ئاراستەکان بە یەکەوە بەستراون، هەر ئاوهایش بە زەبری رەگەزی (ەوە) واتای (هاتنەوە) بەستراوە بە (رۆیشتن)ەوە و واتای (رۆیشتنەوە) بەستراوە بە (هاتن)ەوە. هەر لە بەر ئەوەیە کە رووکاری کارەکە گۆڕاوە لە باری (یەك لۆیی)یەوە بۆ باری (دوو لۆیی) و ئەم بارە دوایی پسوولەی سەربەخۆیی نیە، چونکە تەواوکەرە بۆ کارێکی تری دژ واتا.

### ٥/١١: تەسککردنەوەی واتایی:

لە کۆپلەکانی پێشوودا، واتای گشتی و فراوانی رووداوی کارەکە نەختێك دەگۆڕا، چونکە دەبوو بە (تەواوکەر) بەرانبەر بە کارێکی یەکلۆی دژواتا. واتە، واتای کارەکە ناگۆڕێت بە تەواوی، بەس پێکهاتەیەکی واتاکەی دەگۆڕیت، کە بریتیە لە پێکهاتەی (ئاراستەی روودان)، یان رووداوی کارەکە لە سەر باری دژئاراستە دەچەسپێت. بە شێوەیەکی تر، لە کۆپلەی (٢/١١)دا، تەنها وچانێك دەکەوتە نێو رووداوی کارەکە، بەلاّم لە کۆپلەی (٣/١١)دا، زەبری پاشگری (ەوە) واتای کارەکەی دەکرد بە دژئاراستەی کارێکی تر، بە نیوسووڕی (١٨٠پلەیی). لە کۆپلەی (٤/١١)دا، دوو جار باری دژئاراستەیی دەچەسپا و کاری یەکەم بە سووڕێکی تەواو دەهاتەوە سەر هەمان رێچکەی یەکەم. لە ئەم رێچکە تازەیەدا، بارەکە زۆر  زۆر ئاڵۆزە و واتای بنجی کارەکە لە لایەکەوە تەسك دەبێتەوە بەرەو واتایەکی نوێ و بەرتەسك و لەلایەکی ترەوە بارەکە گشتی نیە و ئەم بەرگە تەنها هەر بەشێك لە کاری زمانەکە لە بەری دەکەن و واتایان دەگۆڕێت. ئەو واتایانەی کە بە زەبری پاشگری (ەوە) تەسك دەبنەوە هەر هەموویان ئاکارێك کۆیان دەکاتەوە و ئەویش ئەوەیە کە سێ جۆر لە واتای نوێ پەیدا دەبێت. یەکەمیان بریتیە لە (روودانی سەت لە سەت) و دوەمیان بریتیە لە واتای (روودان بە بلاّوبوونەوە) و سێیەمیان بریتیە لە ( بەردەوامی) لە روودانی کارەکەدا. واتە، رووداوی کارەکە بە شێوەیەك دەچەسپێت کە لە واتای رەها و بەرفراوانی دەربچێت و روو بکات لە چەسپاندنی رووداوی (دوا تنۆك). یان، لە هەندێك کاری تردا بە چەشنێك دەچەسپێت، کە روودانی کارەکە بچێتە سەر رێچکەی (بەردەوامی و بلاّوبوونەوە) بە تەواوی.

### ٦/١١: واتای ئەنجامدان تا دواتنۆك:

لە هەندێك کاری زمانەکەدا، کاتێك کە پاشگری (ەوە) بە کاردەهێنرێت، واتای کارەکە تەسك دەبێتەوە، چونکە رووداوی کارەکە لە باری گشتیەوە روودەکات لە بارێکی تایبەتی، وەك:

یەكەم: كاری (بڕین، بڕینەوە)، كاری (بڕین) واتایەكی گشتی هەیە وەك ئەنجامدانی هەر بەشێك لە كردەوەی (بڕین)، كەچی (بڕینەوە) واتای ئەنجامدانی گردەبڕ پەیدا دەكات، وەك:

- (بڕین)ی دارێك: مەرج نیە دارەكە دوو لەت ببێت و دەشێت هەر رێژەیەك لە كردەوەكە ئەنجام درابێت، كە گرنگ نیە لە واتاكەدا.

- (بڕینەوە)ی دارێك: مەرجەكە دارەكە دەراودەر دوو لەت بووبێت. واتە (سەت لە سەت) كردەوەكە ئەنجام درابێت، كە دەبێت گردەبڕ و دیواودەر بێت.

دووەم: كاری (سڕین: سڕینەوە) دەتوانین روو بكەین لە ئەم دوو واتایە:

- (سڕین)ی تەختەكە: واتە ئەنجامدانی كردەوەی (سڕین) بەبێ بایەخدان بە رێژەی سەدی كردەوەكە.

- (سڕینەوە)ی تەختەكە: واتە، ئەنجامدانی كردەوەكە بە تەواوی لە گەڵ بایەخدان بە رێژەی سڕینەوەكە تا دواتنۆك بێت.

سێیەم: كاری (وەستان: وەستانەوە): بە تەریبی لە گەڵ ئەو دوو نموونەیەی پێشوودا، لە ئێرەیشدا هەمان بۆچوون هەیە، وەك:

- (وەستان)ی ئۆتۆمۆبیل: واتە ئەنجامدانی كردەوەی (وەستان) بەبێ بایەخدان بە رێژەی ئەو جوولە وزەیە كە تێیدا هەیە.

- (وەستانەوە)ی ئۆتۆمۆبیل: واتە ئەنجامدانی كردەوەی (وەستان) لە پاش خەرجكردنی هەر هەموو جوولە و وزەكەی، وەك: ئۆتۆمۆبیلێك كە لە ژێر ركێفی شوفێرەكەی دەرباز دەبێت، لە پاش ماوەیەك بە خۆی دەوەستێتەوە.

چوارەم: كاری (ماڵین: ماڵینەوە): بە هەمان شێوە لەم نموونەیەشدا هەمان بۆچوون هەیە، وەك:

- کاری (ماڵین): واتە ئەنجامدانی رووداى (ماڵین) لە خاڵێکەوە بۆ خاڵیکی تر بە بێ بایەخان بە بڕی کردەوەکە.

کاری (ماڵینەوە): واتە ئەنجامدانی رووداوی (ماڵین) بە شێوەیەك کە هەموو رووبەرەکە بگرێتەوە.

بەم ئەم شێوەیە، نموونە زۆرە و لە هەمان کاتدا زۆر ئاڵۆز و تێکئاڵاون، بەڵام ئەم چوار نموونەیە بەسە. لەلایەکی ترەوە، ئەم جۆرە چاوگە دوولۆیەی کە پاشگری (ەوە) هەڵ دەگرن و واتای ئەنجامدانی تەواوی رووداوەکە دەبەخشن، کەرەستەیەکی خاوی زۆر شیاو و لەبارن بۆ (واتای خوازراو) وەك لە پاشتردا باس دەکرێت.

**٧/١١: واتای بڵاوبوونەوە و بەردەوامی:**

یەکەم: ئەگەر بە چاوی سەرنج بڕوانین لە هەندێك لە کاری زمانەکە، دەبینین کە رەگەزی دووپاتکردنەوە (ەوە) سیمای بڵاوبوونەوە دەبەخشێت، وەك:

| کاری بنجی | کاری دووپات |
|---|---|
| بزوتن | بزوتنەوە |
| جووڵان | جووڵانەوە |
| کەوتن | کەوتنەوە |
| خستن | خستنەوە |
| تەنین | تەنینەوە |
| پرسین | پرسینەوە |
| بەخشین | بەخشینەوە |

لە هەموو ئەو چاوگە دوولۆیانەدا، ئاکاری (بڵاوبوونەوە) زۆر ئاشکرایە.

دووەم: ئەگەر بە چاوی سەرنج بڕوانین لە هەندێك کاری تر، دەبینین کە سیمای بەردەوامی هەیە بە شێوەیەك کە ڕووداوی کارەکە دووبارە ببێتەوە بە بەردەوامی، وەك:

- سووڕانەوە: تەسککردنەوەی واتای فراوانی کاری (سووڕان) بە چەشنێك کە سووڕێك بە تەواوی بچەسپێت و لە پاشتردا ڕووداوی (سووڕان) بەردەوام بێت.

- خولانەوە: بە هەمان شێوە ئەم کارەیش هەر سیمای (خولْ خواردن)ی بەردەوام هەڵ دەگرێت، نەك واتا فراوانەکەی کارە بنجییەکەی.

- لەرینەوە: لە ئەم کارەیشدا واتای فراوانی کاری (لەرین) تەسك دەبێتەوە بە سەر واتای بەردەوامی لە لەرەلەردا.

کەواتە، دەبینین کە لە هەردوو بارەکەدا (بەردەوامی) هەیە، بەڵام لە جۆری یەکەمدا بەردەوامیەکە لە بڵاوبوونەوەدایە[٣٣].

### ٨/١١: واتای خوازراو لە پاشگری (ەوە)دا:

ئەوەی تا ئێستا باسکرا، تەنها و تەنها هەر لە سنووری (واتای بنجی)دا بوو. واتە، هەموو ئەو واتایانە بنجین و خوازراو نین. سەبارەت بە (واتا خواستن) هەر هەموو ئەو واتا بنجیانە بۆیان هەیە کە کراسی واتای (خوازراو) لە بەر بکەن، بەڵام بە ڕێچکەی جیاواز، بە پێی بیردۆزەکانی واتاخواستن. کەواتە، ئەم واتایانە بریتین لە بارێکی تەریب بە واتای بنجی. بە ئەم پێیە، ئەم بیرۆدۆزەیە چەن ڕێچکەیەکی تر دەکاتەوە بەرانبەر بە ئەوانەی کە لە واتای بنجیدا باسکران. لە ئەم ئاستەدا. دەتوانین چەند واتایەکی خوازراو ریز بکەین. بۆ ئەو نموونانەی کە لە پێشتر بەکارهێنراون، وەك:

---

[٣٣] لە ئەو سێ ڕێچکە واتاییەدا کە باسکران. کەلکێکی گەورە وەرگیراوە لە نیشەکانی (د. نەسرین فەخری) (سەرچاوەی ٢ و ٦) و لە ئەو سەرچاوانەی بەکارهێنراون. لە ڕاستیدا، ئەو بابەتە بوە بە کەرەستی خاو بۆ نیشەکەی ئێمە. تا بتوانین بی گەیەنین بە ئەم ئاستە. لەگەڵ ئەوەیشدا، لە ئاستی زۆر نموونەی لێڵدا دەستمان پاراستوە و تۆمارمان نەکردووە.

بڕینەوە: یەکلایی کردنەوە (الحسم)

سڕینەوە: نەهێشتن (المحو، الابادە)

وەستانەوە: نەمانی چالاکی (العجز)

ماڵینەوە: تالآنکردن (النهب)

تەنینەوە: بلآوبوونەوە (الانتشار)

بەخشینەوە: دابەشکردن بەخێر (النذر)

پرسینەوە: بەدواداچوون (المتابعة و الملاحقة)

خستنەوە: نەوە و وەچە خستنەوە (الانجاب)

کەوتنەوە: بەرپابوون (الاندلاع، الشروع)

لەلایەکی ترەوە، دەبینین کە واتای خوازراو زۆر زۆر بەربلآوە و زۆر پەیت و گرانە و لە لێکدانەوەودا ناتوانرێت بە وردی یەکلایی بکرێتەوە. بۆ نموونە، ئەو نموونانەی سەرەوە دەتوانن واتای تر بدەنەوە و دەشێت واتای تریان هەبێت، کە بیری ئێمە نەی قۆزتووبێتەوە. بەڵێ، ئەلبوومی واتای خوزراو زۆر زۆر گەورەیە و ئاوەها بە ئاسانی دابین ناکرێت و پێویست بە چەندین لێکۆڵینەوە دەکات، بە تایبەتی لە ئەو بوارانەدا کە ڕووداوی فیزیاوی ناچەسپێت. بەرانبەر بە ئەمانە، واتای خوازراو هەیە بە (شێوازگری) و بە (شوبهاندن). بۆ نموونە، لە (هاتنەوەی کارەبا)دا شێوازی ژەم ژەم و پچڕ پچڕی کارەبا دەهێنێتە نێو بیرەوە. ئەم واتایە، لە واتایەکی خوازراو و دەچێت. یان، لە نموونەیەکدا وەك (برژانەوەی برین) پەنا دەبرێت بۆ واتای خوازراو و بە (شوبهاندن). بێگومان، لە ئەم ئاستەدا کێشەکە زۆر ئاڵۆزە و پلیکانەی لێکۆڵینەوە لێڵ دەبێت لە بەر چاو، چونکە هەندێك لە پلەکانی لە بەرچاونین و بە ئاسانی نابینرێنەوە.

بە هەر حاڵ، ئەوەی گوترا برێتیە لە بەرکوڵێك لە سەر واتای خوازراو، کە نابێت تێکەڵ بکرێت لە گەڵ ئەو واتا بنجیانەدا کە دەستنیشان کران.

**٩/١١: بەرەنجام و گفتوگۆ:**

- پاشگری دووپاتکردنەوە (ەوە) دەچێتە سەر هەموو چاوگێك، چی بنجی، چی داڕێژراو، چی لێکدراو. لە پاشتردا، دەچێتە سەر هەر ڕێژەیەك، یان ناوێك کە لە ئەو چاوگانەوە وەرگیرابێت. ئەم گوتەیەیش تەنها و تەنها هەر کاری (بوون) و کاری (هەبوون) ناگرێتەوە. لە گەڵ هەموو ئەوەیشدا چەند سیمایەك و چەند ناکارێکی واتاسازیانە هەن و شایستەی ئەوەن کە تۆمار بکرێن:

لە یەکەم هەنگاودا، دوو ڕێچکەی پانی واتایی دەست نیشان دەکرێت وەك:

ڕێچکەی یەکەم: دووبارەبوونەوە و واژکردنەوەی ڕووداوی کارەکە لە نوێوە، وەك لە ئەم ڕاڕەوانەدا دەردەکەوێت:

(١): دووبارە بوونەوە بە وچان، وەك: (دیسان شیلان نامەکەی بردەوە).

(٢): دژواتایی و دژئاراستەیی لە لۆی دوەمی ڕووداوی کارەکەدا، بەرانبەر بە کارێکی دژواتا، وەك: (شیلان نامەکەی هێنا و نامەکەی بردەوە).

(٣): دژواتایی هاوئاراستە لە لۆی دوەمی ڕووداوی کارەکەدا، وەك: (شیلان نامەکەی هێنا و نامەکەی بردەوە و دیسان هێنایەوە).

ڕێچکەی دوەم: تەسکبوونەوەی واتای ڕووداوی کارەکە بە سەر ڕاڕەوێکی تایبەتیدا، وەك:

(١): واتای ئەنجامدان تا دوا تنۆك، وەك: (شیلان گرەوەکەی بردەوە).

(٢): واتای بڵاوبوونەوەی بەرەبەرەیی، وەك: (تۆپەکە وەستایەوە).

(٣): واتای بەردەوامی، وەك: (پەروانەکە خولایەوە).

- لە ڕێچکەی یەکەمدا، بە هیچ جۆرێك واتای بەرین و فراوانی کارەکە تەسك نابێتەوە لە باری دژواتاییدا. بە پێچەوانەوە، لە ڕێچکەی دوەمدا واتای بەرین و فراوانی کارەکە تەسك دەبێتەوە بە سەر واتایەکی تایبەتیدا. بۆ نموونە، ئەگەر کاری (بڕین) واتایەکی ڕەها و بەرینی هەر جۆرە (بڕین)ێك بداتەوە، بەڵام (بڕینەوە) تەنها واتای (بڕین)ی گردەبڕ و دەراودەر دەدات.

- ئەو واتایانەی کە بە زەبری پاشگری (ەوە) تەسك دەبنەوە بە سەر بارێکی تایبەتیدا، هەر هەموویان لە ژێر ڕکێفی ئەنجامدانی تەواوەتی ڕووداوی کارەکەدا، جێیان دەبێتەوە، بەڵام بە شێوازی جیاواز.

هەردوو واتای (بڕین) و (بڕینەوە) واتای بنجین، هەرچەندە کە (بڕینەوە) سیمایەکی واتاسازییانەی تازەی هەڵگرتبێت و واتاکەی گۆڕابێت لە واتای (بڕین). لە ئەم ڕووەوە، هەر واتایەکی بنجی کە بە زەبری پاشگری (ەوە) پەیدا بووبێت بۆی هەیە ببێت بە خاڵێکی (واتادانەوە) بۆ پەیداکردنی واتای (نابنجی). بۆ نموونە (بڕینەوەی منداڵ لە شیر) بریتیە لە واتای نابنجی (بڕینەوە)، بەبێ بەکارهێنانی کەرەستەی (بڕینەوە)، یان هەبوونی (بەرکار)ێك کە بکەوێتە بەر ڕووداوی فیزیاوی (بڕینەوە). هەر لەبەر ئەوە، داوای لێبوردن دەکەین کە زۆر بە خێرایی بە سەر واتای خوازراوی نابنجی تێ دەپەڕین. یان، لە ئەو کارانەدا کە پاشگری (ەوە) وەردەگرن، واتای خوازراو زۆر زاڵە و زۆر بە بڕەوە بۆ پەیداکردنی واتای نوێ. هەر لەبەر ئەوە، واتاکان تێکەڵ دەبن و کوردیزانی پتەو نەبێت، ناتوانێت لە یەکتری جودایان بکاتەوە. لە ڕاستیدا، ئێمە هەر هەموویان بە زەبری زمانی شیری ئەو واتایانە دەزانین. ئەوەیش زۆر گرنگ نیە و ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە کە دەبێت بە (ڕێزمان) و بە بیردۆزەکانی زمان جودایان بکەینەوە. ئەم نووسینەیش سەرەتایەکە و دەشێت چەندین نووسینی تر بە دوایدا بهێن.

- لە ناوەڕۆکی ئەم نووسینەدا هەندێك کار باس نەکران کە پاشگری (ەوە) واتایان تێدا دەبەستێت. یان دەتوانین بڵێین: واتاکەیان زیندوو دەکاتەوە، وەك (کووژانەوە، توانەوە، پاڕانەوە، ....).

**۱۰/۱۱: پاشکۆی (ـەوانێ):**

لە شێوەزاری سلێمانیدا، پاشکۆی (ـەوانێ) دەخرێتە سەر کلکی پاشگری (ەوە)، وەك (هاتـەوە|ەوانـێ)، یـان بـە کـورتی (هاتـەوانێ). بـە بۆچـوونی ئێمـە، پاشـکۆی (ــەوانێ) سەربەخۆیە لە پاشگری (ەوە)، چونکە بەبێ ئەو پاشگرە و لە گەڵ ئەوە پاشگرە، دەشێت بە کار بهێنرێت و دوو واتا لە یەکتری جودا بکاتـەوە، وەك: (۱- هـات: هاتــەوانێ) و (۲- هاتەوە: هاتەوە|ەوانێ). بەڕاسـتی، گشـت کاتێـك ئـەرکی پاشـگری (ەوە) ئەوەیـە کـە، بـە جۆرێك لە جۆرەکان، واتای ڕووداوی کار بگۆڕێت، بەڵام ئەرکی پاشگری (ەوانێ) تەنها و تەنها ئەوەیە کە وەك ئاوەڵکارێك واتای دووبـارە بوونـەوەی ڕووداوی کارەکـە زاڵ بکـات. تەنها جیاوازیش لە نێوان ئەم دوو مۆرفیمەدا ئەوەیە کە لە بەکارهێناندا پاشگری (ەوە) ئەستێرەی بەختی گەشە و بەرەو (پتەوبوون) دەڕوات، بەڵام پاشکۆی (ەوانێ) ئەستێرەی بەختی زۆر کزە و بەرەو (لاوازبوون) دەڕوات. تەنانەت، وا خەریکە بـەرەو (نغرۆبـوون) دەڕوات، چونکە شەقاوی قەڵەمڕەوی ناگات بە (زمـانی نووسـین). لـە ئـەم لاوازبوونـەدا، پاشگری (ەوە) و ئاوەڵکـاری دی، وەك (دیسـان)، ئـەو بۆشـاییانە قـەرەبوو دەکەنـەوە کـە غلۆربوونەوەی پاشکۆی (ەوانێ) دروستیان دەکات. بە هەرحاڵ، زۆر ئەستەمە کە پاشکۆی (ەوانێ) ببووژێنرێتەوە، بەڵام هەندێك نموونە دەخەینە ڕوو کە دەشێت کەڵك ببەخشێت بە توێژەران، وەك:

هات ــــــ ــــــ : فۆرمی بنکەیی

هاتـ ـــەوە ـــــ : واتە، لە پیشتردا ڕۆیشتبوو، بەڵام گەڕایەوە

هاتــ ـــ ـەوانێ : واتە، لە پیشتردا هاتبوو، بەڵام جارێکی تر هاتەوە

هات ـەوە ـ وانێ : لە پیشتردا گەڕابوەوە، بەڵام جارێکی تر گەڕایەوە

لە ئەو نموونانەدا، نموونەی چوارەم (هاتەوەوانێ) لە زۆرلێکراو دەچێت، بەڵام بۆ مەبەسـتی توێژینـەوە خراوەتـە ڕوو. بـە هـەر شـێوەیەك بێـت، بـە هیـواین توانبێتمـان تشتێکی نوێ بخەینە سەر بابەتەکە. یان، توانبێتمان سەرەتای ئەخشەیەك دابڕێژین بۆ ئەتڵەسە گەورەکەی پاشگری (ەوە). گومان لە ئەوەیشدا نیە کە ئەم نووسـینە ناتوانێـت

**هەموو بابەتەکە دابپۆشێت، چونکە هێشتا زۆر نموونە و زۆر وردە بابەت ماون، کە خراونەتە ژێر لێوەوە. لە ڕاستیدا، ئەم لێکۆڵینەوەیە لە بیری ئێمەدا کەوتوەتە ئیش و ڕۆژ بە ڕۆژ دەگەین بە رووبەرێکی نوێ [٢٤].**

[٢٤] دەبێت بمانبەخشن کە زۆر بە سادەیی بەسەر ئەم بابەتەدا دەڕۆین. واتای خوازراو، لە پاشگری (ەوە)دا، دەرگایەکی گەورە دەکاتەوە لە لێکۆڵینەوەدا. بە هیواین لە داهاتوودا بتوانین بە شێوەیەکی فراوانتر چارەسەری بکەین. گومان لە نەوەیشدا نیە کە مەبەستی ئێمە لە دەوری واتای بنجی دەخولێتەوە. لە ئەم ڕووەوە، دەبێت هێڵێکی سوور بکێشرێت لە نێوان (واتای بنجی) و (واتای خوازراو)دا.

**سەرچاوە:**

١- د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ەوە)/ هەولێر ٢٠٠١.

٢ د. نەسرین فەخری، چاوگی بێ واتا، لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٧٣.

٣- شێخ محەمەدی خاڵ، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دوەم، بەشی یەکەم، بەغدا١٩٧٤.

٤- مەسعود محەمەد، وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا١٩٧٤.

٥- ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨١.

٦- د. نەسرین فەخری، پاشگر و پێشگری (ڤە –یان-وە) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٧٣.

7- Bescherelle، L'art de Conjuguer، Dictionnaire de 12000 Verbs، Hatier، Paris 1980.

8- QUENELLE and HOUROUIN، 6000 Verbs Angais، Collection Bescherelle، Hatier، Paris 1995.

## کتێبە بڵاوکراوەکانی نووسەر

١- ڕستە سازی و شیتەڵکاری زانستی، هەولێر ١٩٩٦

٢- میکانیزمە بنەڕەتیەکانی ڕستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون، هەولێر ١٩٩٧

٣ داینامیزمی جێناوی لکاو لە ڕستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧

٤ نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی کار، هەولێر ١٩٩٩

٥ لە مۆرکە ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی ، هەولێر ٢٠٠٠

٦ بەرەو ڕێزمانی کوردی : بەرەو زمانی نووسین، هەولێر ٢٠٠٠

٧- شرۆڤەکاری ڕێزمانی لە زمانی نووسیندا، هەولێر ٢٠٠٠

٨- ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ـەوە) ، هەولێر ٢٠٠١

٩- ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاك، هەولێر ٢٠٠٤

١٠ دەنگسازی و بڕگەسازی، هەولێر ٢٠٠٥

١١- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ، هەولێر ٢٠٠٦

١٢- زمانی نووسینی ڕێزماندار، هەولێر ٢٠٠٨

١٣- بەردو وشەڕۆنان لە زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٨

١٤- هەندێك لە ئاکارە ڕەنگینەکانی ڕێزمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٨

١٥- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٩

١٦ بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠٠٩ ( نووسینەوەی یەکەم)

The Phonemic Junction Faculty

١٧ بەرەو زانستی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردییەوە، سلێمانی ٢٠١٠.

١٨ بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠، (نووسینەوەی دوەم، پێداچوونەوە و نۆژەنکردنەوە)

2nd edition،The Phonemic Junction Faculty

١٩- بە زمانی ئنگلیزی. هەولێر ٢٠١٠ Engineering Phonology

٢٠- سێ میكانیزمی ڕێزمانی، دەزگای موكریانی، هەولێر ٢٠١٢

٢١- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣ Vowel Power Theory

٢٢- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣ Phonetic Engineering

٢٣ ڕێزمانی كاری ناسادە، هەولێر ٢٠١٤

٢٤- بەرەو ڕێزمانی ناوەڵناو، هەولێر ٢٠١٤

٢٥- دەنگسازی زمانی كوردی بە تیۆری زەبری بزوێن، هەولێر ٢٠١٤

٢٦- بنچینەی ڕێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠١٤

٢٧- بڕگەسازیی كوردی لە تیۆری زەبری بزوێندا، هەولێر ٢٠١٤

٢٨- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٤

Syllabification and Re-syllabification Processes

٢٩- ڕستەسازی و شیتەڵكاری زانستی/ نووسینەوەی دووەم / هەولێر ٢٠١٥

٣٠ بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٥

Minimized Phonology and Phonetic System Insertion

٣١- ڕێزمانی بوون و هەبوون لە شرۆڤەكاری زانستیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٢- بنچینەی دەنگسازی لە زمانی كوردیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٣- پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، هەولێر ٢٠١٥

٣٤- زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردا، هەولێر ٢٠١٥

٣٥- چەند وانەیەك لە ڕێزمانی كوردیدا، هەولێر ٢٠١٥

**٣٦- پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی جێناو، هەولێر ٢٠١٥.**

**٣٧ - گەشتێك بە نێو ڕێزمانی كاردا، هەولێر ٢٠١٦**

٣٨- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی بوون و هەبووندا، هەولێر ٢٠١٦.

٣٩- گەشتێك بە نێو ئامرازەكانی ڕێزمانی كوردیدا، هەولێر ٢٠١٦

**٤٠- سێ مۆركی ڕێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠١٦، (ئەم كتێبەی بەردەست).**

| ئەو کۆلکانەی دەکەونە پاش کار | | | | | | | خانەی | ئەو کۆلکانەی دەکەونە پێش کار | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ... | ٦- | ٥- | ٤- | ٣- | ٢- | ١- | (سفر) بنجی کار | ١+ | ٢+ | ٣+ | ٤+ | ٥+ | ... |
| سنووری رستە | | | | | | | | | | | | | |

نەخشەی (١/٨): خانەی (بنجی کار) لە پلیکانەی رستەدا

MINARA PRINTING PRESS
چاپخانەی منارە - هەولێر
مطبعة منارة 0750 445 6297